# ژانی مان

کرێکار

چاپی سێیەم

١٤١٨ك ـ ١٩٩٨ز

# پێشکەشە

بە ئامەزرۆیانی شەهیدی لە هەرکوێ هەن .



# پێشەکی چاپی دووەم

پێش شانزە ساڵ لەمەوبەر چەند برایەکی دڵسۆز شیعرەکانی - کە لەساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٢) نووسیبوومن - کۆکردەوەو لە دووتوێی تیانووسێکی جواندا پێشکەش بەخۆمی کردەوە ! لە ساڵی ١٩٨٢ شدا برایەك لەشاری پاوەی کوردستانی ئێران بە خەتێکی جوان نووسی‌یەوەو ئامادەی چاپی کرد .. پاشان لەلایەن چەند برایەکی ترەوە کە زۆر ئەمەدەناسین بەچاپ گەیشتەو (الحمدلله) لە هەردوو بەشی کوردستاندا بە خۆشحالی‌یەوە قبووڵ کرا ...

هەر زوو نوسخەی لە بازارەکاندا نەما ..ئیتر منیش کەوتمە وولاتانی ترو دوای راپەرینەکەش کاروباری سیاسی‌و بزاڤی رابوونی ئیسلامی -کە وەك بورغویەك لەخۆی پێچام - نەیهێشت بپەرژێمە سەر دیوانی کۆن .. بەشێکی نوێتری شیعریشم ئامادە کرد کە بەناوی (ژانی مان) دوە لەچاپی بدەم بەڵام کارەساتەکەی ساڵی ١٩٩٣ ی بزووتنەوە کاتی ئەوەی لێسەندمەوەو بەکاری گرنگتری ململانێی مانەوە خەریك بووینەوە.. تا دەشهات داوای لەچاپدانەوەی (ژانی بوون) و(ژانی مان)یش زۆرتر دەبوو - تا ئیتر وام بەباش زانی هەردووکیان بنووسمەوەو پێکەوە چاپیان بکەم .. کەوا (الحمد لله) رێککەوت .

بەشی سێیەمی شیعرەکانیش کە لە دوای ساڵانی ١٩٩٣وەن ، ماون و -ان شاء الله - دەرفەتی چاپ‌وبڵاوکردنەوە بۆ ئەوانیش دەرەخسێ ..

هیوادارم خوێنەرانی بەرێز دوای خوێندنەوەی ئەم کۆمەڵە شیعرانە هەڵیان سەنگێنن‌و رەخنەکانیام پێرابگەیەننەوە .. خۆشحاڵ دەبم چونکە دەزانم هەرچەند کەم‌وکوورتیشیان تێدابێ -کە زۆریشن- بەقەدەر ئەوان راستگۆیی‌و دڵسۆزیان لەخۆگرتووە بۆ ئیسلامی رێبازو کوردی کەسی خۆم‌و کوردستانی وولاتی بێبەرژێنم ... ئازادتر بن .

کرێکار

سلێمانی (١٤١٨ك-١٩٩٨ز)

## شیعرەکانم بۆ کێ دەوێ ؟

شیعرەکانم ....

- ئەگەر نەبوونە بەستەی کرێکارێك با خەلفەیەك وەك تەلاشە بەرد نقومی ژێر جەبلەیەکی ناوکاریان کات .
- با بەرد هەلکەنێك ژێر تاوێرە بەردیان نێ‌و نووزەیان ببڕێت.
- ئەگەر نەبوونە (هۆرە) جوتیارێك با خۆی بەگاسنەکەی ژێر گلیان نێ .
- ئەگەر نەبوونە زەنگوڵەی کاروان‌و قەتارچی با روویان وەك قۆرییەکەی رەش کرێن .
- ئەگەر نەبوونە سرودی قوتابیانی زانکۆ ، با زمانیان لە زیندانی ئاسایش (ئەمن) دا بقرتێنرێن .
- گەر نەبوونە قردیلەی ژێر سەرپۆشی خوشکێکی موسوڵمان ، با بدرێنە دەست (سارتەر)ێ .
- گەر نەبوونە گرو گاڵی منالانی ئیسلام ، با بخرێنە بەر رمی هۆلاکۆ

ئاشتیخوازەکانی سەدەی بیستەم .

ئەگەر نەبوونە سروودی موجاهیدانی ئیسلام ، با ژێر تانکی(ستالین)ەکان کەون لە ئەفغان وسوریاو عێراق و صۆمال .

ئەگەر نەبوونە ئاهی کۆست کەوتوی بێ شوانی کورد ، با بدرێنە دەست ئازم گوزارانی بەعس .

گەر نەبوونە دەنگی بیلالی ئەوەی ئوێ ، با پەتی (ئومەیە) جاهیلیەکانیان بکرێتە مل . کە لە مێژووی نوێ و داهاتوودا لە (دار الندوة) کۆ دەبنەوە .

ئەگەر وا نەبوون ، مەهێڵن لە هیچ چاپخانەیەکدا لەدایک بن ..

کرێکار / ١٩٨٣

# شیعرەکانم

١٩٨٠/٧/٢٢ .....

شیعرەکانم سواڵکەریْ نین
خۆ وا فێر کەن ..
ماڵان بگەڕێن بۆ نانێ
یا وەك شاعیرانی ( کوفر )
لەسەر هەموو سفرە و خوانێ
خۆیان تێر کەن ..
شیعرەکانم ، با بزانن
دەنگی هەموو چەوساوەکانی جیهانن
ڕەنجبەرێکن تا دوا تەمەن
خزمەتکاری ڕەش و ڕووتی
( شانەدەری) و( کەس نەزان )ن [1] ...
موسوڵمانن ، تا دوا تەمەن
ناڵەی ( یاسر و سومەیـیە )ی [2]
بێشوانیئەم سەردەمەن



[1] شانەدەری و کەس نەزان دوو دێی هاوچەرخین کە پێیـان دەڵێن ( مجمع سکنی ) یەکەمیان لە سلێمانییە و دووەمیان لە هەولێرە . ئەو کوردانەیان تێدا نیشتەجێ کران کە لە دێیەکانی سەر سنووری عێراق و ئێران گوێزرانەوە.

[2] یاسرو سومەییە : یەکەمین و دووەمین شەهیدی ئیسلامن کە لە سەرەتای ئیسلامدا ، لە ژێر ئەشکەنجەو ئازاردا شەهید کران.

شیعرەکانم
بەیت و باڵۆرەی شایەر نین
لە هەموو شایی و زەماوەند
ببنە مێشێ
بە دەم کڕنووش بردنەوە
بۆ شاباشێ
بچنە پێشێ
لە دەوری سەری دەوڵەمەند
کۆ ببنەوە ...
شیعرەکانم خوا پەرستن
هۆشیارن
وەك موسوڵمانی بە هەستن
گشت پیتەکانی ئاگرین
ئاگرێکی پڕ سۆز و قین
ئەڵێن ئێمەین هەتاکو هەین
قەت بۆ سامانی دونیایی
نە بۆ ( فیرعەون ) نە بۆ (نەمرود) [٣]
وەکو ( زنڕە ) [٤]
نابین بە سروود



---

[٣] فیرعەون : پاشای میسز بوو لە سەردەمی سیدنا (موسا) دا (سەلامی لێ بێت) .
نەمرود : پاشای عێراق بوو لە سەردەمی سیدنا (ئیبراهیم) دا (سەلامی لێ بێت) .

[٤] مەبەست لە سروودی (سەرۆکمان زنڕە)یە کە بۆ صەدامی طاغوت دەوترا .

شیعرەکانم هەرزەیەکی کۆڵان گەڕ نین
بێ بڕوا نین
لە سوچێکی ئەم شارەدا
بۆ تێڕوانین
وەك پاسەوان
ئێشك بگرن
هەتا ئەمرن ...



شیعرەکانم کاتێ لێرە سەر ئەبڕرێن
جەرگ و دڵیان دەر ئەهێنرێن
شەهید دەبن
بەس نامرن
ئەوجا دەڕۆن .. لێرە دەڕۆن
دەچنە میسر.. دەچنە سوریا
دەچنە ئەفغان
لە جێیەکی ( رۆژهەڵات ) ا
ستارئەگرن
لە هەرجێ بن ، کە دەگەنێ
وەك بارودخانەی سەفەری
دەبنە کودی
پڕ بارودی
ساچمە زەنێ ..
شارەزایەکی خوا ناسن
بۆیە خۆیان بە لاقەدی
موجاهیدێکی ئیسلاما هەڵ ئەواسن ...

# بۆ چەوساوەکان

... ١٩٨٠/٧/٢٦

چەوساوەکان
زەحمەت کێشە بێ ناوەکان
هێندەی شۆڕشتان پێ کرا
چەند مافی ڕەواتان خورا
ئەوەندەی لەم جیهانەدا
جۆگەی خوێنتان هەڵبەسترا
ئەوەندەی لەم ژیانەدا
ڕەنجتان برا
خۆشم ئەوێن ...



چەوساوەکان
ئەی تینووە بێ ناوەکان
بە قەد ژمارەی دڵۆپی
خوێنی بە ئارەق بووی گەشتان
کە لە تاوێان هەتا بەیان
جینگڵە ئەدەن
خۆشم ئەوێن ...



چەوساوەکان
شێخەڵە هەڵ پاچڕاوەکان

ئەوەندەی نوێڵی بەرد هەڵکەن تینی دەوێ
ئەوەندەی تەڵەزمە بەردو ژەنگەو گەچتان بەر ئەکەوێ
بەو ژمارەی پشتی سەپان لە تەمەنیا دائەنەوێ
لەوەش زیاتر
ئەوەندەی کە خواو پێغەمبەر
دەستی کرێکاریان خۆش ئەوێ
خۆشم ئەون ...



چەوساوەکان
ئەی ئاسمانە هەساوەکان
کرێکاری دەست قڵیشاو
سەپانی بەر سووری هەتاو
کاروانی لە ماف بە جێماو
ئەی کوڵ هەڵگری پشت چەماو
رەش و رووتی کۆیلە کراو
لە هەر کوێ هەن
ئەوەندەی خۆتان رەنج ئەدەن
خۆشم ئەون
کەس نەڵێ بۆ ؟
چونکە هەموو موسوڵمانی جیهان هەون ...



# هەوێنی شیعرەکانم

١٩٨٠/١٢/١

**وەڵامە بۆ ئەوانەی لە هەوێنی شیعرەکانم دەپرسن**

هەموو ئەوەی خۆشم ئەوێن
(ژان) و (شەهیدی) و (چەك) و (خوێن)
بۆ هەموو پارچە شیعرێکم
بۆ خۆیان دێن
بۆ مەیینیان دەبنە هەوێن
ئەو ووشانەی
هەر ئاهـ و ئۆف و ئازارن
هێمای ( ژوار )ن
ژواری تلۆقی تەقیوی
لەپی دەستی کرێکارن



ئەو ووشانەی
خۆزگە و عەزرەت و تامەزرۆن
خۆشەویستی ( شەهیدی ) ەو
هەڵقولاوی
گۆشت و خوێن و هەست و سۆن



ئەو وورشانەی
( چەك) و هێز و بازوو وتینە
شیری دادە
هێمای قەلاچۆی ( طاغووت )ی
سەر زەمینە



ئەو وورشانەی
(خوێن ) و کاسەی سەری ووردن
خەباتی رێن
دەبێ برژێن
دەبێ بروێن
مافی بوونە و دەبێ بدرێ
پێویستە وورد سەرنج بدا
ئەو کەسەی رێی ( جیهاد ) ئەگرێ .



# مافی بوونی ئیسلام

١٩٨١/٦/١٣ ...

**هێنانەوەی بوونی ئیسلام**
**ئارامگری گشت پێغەمبەرانی دەوێ**
**خۆڕاگرتن لە زیندانا**
**ژینی نێو قورئانی دەوێ ...**
**لە قورئانا**
**هێنانەوەی بوونی ئیسلام**
**رەنجی دەوێ**
**یەکەم هەنگاو هەتا ئەنجام**
**لیژنە لاشەی گەنجی دەوێ**
**لە قورئانا**
**هێنانەوەی بوونی ئیسلام**
**سووتی دەوێ**
**کۆمەڵێکی چاونەترسی**
**شوێن کەوتووی (طالوت ) ی دەوێ [1]**
**لە قورئانا**
**هێنانەوەی بوونی ئیسلام**
**باوەڕی پتەوی دەوێ**
**کاری ( نوح )ی بەردەوام و [2]**

---

[1] طالوت : فەرماندەیەکی بەنی ئیسرائیلی بوو کە خوا کردبوویە فەرماندەی کۆمەڵیکی جولەکە داوایان کرد بۆ خوا جیهادیان لەسەر فەرز بکات ، تا سەرەنجام لەسەریان فەرز کرا .. پاشان ئەوی باوەڕ لاواز و دنیا ویست بوو : پەشیمان بوونەوە . تەنها ژمارەیەکی کەم مایەوە و چوونە گۆڕەپانی شەڕ و دژی (جالوت) . جا ئەو ژمارە کەمە خوا بە نەبەز و خوا ویست و چاونەترس و خۆگر باسی فەرموون . کە بە هۆی خۆگرتنیانەوە لە گۆڕەپانی جیهاد دا سەرکەوتن . ( سورەتی البقرة /٢٤٦ -٢٥١ )

هەوڵی ڕۆژ و شەوی دەوێ

ڕاوەستاندنی خوێنی زام

لە قورئانا

پەروەردەی ( موسەوی ) دەوێ [٣]



لە قورئانا

بوونی ئیسلام

هێنانەوەو سەلماندن و چەسپاندنی

نرخی دەوێ

خوا ویستی و لە خۆ بوردنی

( ئەصحاب الاخدود) ی دەوێ [٤]

تا شایەتمان و ژانی لەش

ژانی پشتی هەزار بیلالی سپی و ڕەش [٥]

دەبنە سروود

گەر ڕێگا سروودی دەوێ .

---

[٢] نوح پێغەمبەر : سەلامی خوای لێبێت ( ٩٥٠ )ساڵ شەووڕۆژ بانگەوازی خواوریستی بلاوکردەوە.

[٣] پەروەردەی موسەوی : مەبەست لەو پەروەردەیە کە وەك پەروەردە کردن و ژیانی سیدنا موسی بێت . (سەلامیخوای لێبێت ) ، بەو شێوەیەی خوا لە سورەتانی طە و لعراف و القصص و النمل و جێی تردا باسی فەرمووە .

[٤] ئەصحاب الاخدود : ئەو خاوەن باوەڕانە بوون کە خوا لە سورەتی ( البروج ) دا باسی فەرموون کە هەر لەبەر ئەوەی خۆیان نەدا بەدەست دنیا وویستانەوە . ئاگرێکی سامناکی گەورەیان بۆ کرایەوەو سوتێنران .

[٥] بیلال : مەبەست لە بیلالی حەبەشی‌یە . خوا لێی ڕازی بێت . کە یەکێکە لە یارەکانی پێغەمبەر (صلى‌الله عليه وسلم) کاتێك کە موسوڵمان بوو ،.لە لایەن گەورە کافرەکانی‌یەوە -چونکە ئەم موسوڵمان بوو- تووشی ئەشکەنجە و ئازارێکی زۆر بوو . لە هاوینی گەرمای مەککەو لرچەی نیوەڕۆیدا ڕایان دەکێشاو تاوێرە بەردی گەرمیان دەخستە سەر سنگی . ئەویش وێردی سەر زمانی ( احد احد ) بوو ، کە دوژمن زۆر پێی پەست دەبوو..

# کەوو کورد

.... ١٩٨٠/١١/٢٧

ئەڵێن کەویش
وەك کورد نیشتەجێی چیایە
بەڵام دیارە ، هەڵبەت ئەویش
سنووری وڵاتی جیایە.
رەنگە شاپەڕی هەر باڵێ
(پاساپۆرت ) بێ
لە ژێر مۆری ( لا نوافق ) دا بناڵێ [١]
ئەگینا دەبوو جارێك بفڕن
سنووری دەسکردی ئێمە
یەك یەك ببڕن
بچنە سەر لوتکەی ( هیندکوش ) [٢]
تا بکەن پرسەی شەهیدی
( هێرات ) و ( غەزنێ )ی ئەفغانی
وەك لە ( قەندیل ) [٣] لە ( شنروێ ) [٤]
بە کوڵ گریان

---

[١] لا نوافق : مەبەست لە رازی نەبوونی رژێمی بەعسی بەغدایە لە سەر چوونە دەرەوەی وڵات .

[٢] هیندکوش : زنجیرە چیایەکی ئەفغانستانە کە لوتکەی پامیری لێ جیا دەبێتەوە .

[٣] قەندیل : چیایەکە لە پشت قەڵادزێی کوردستان/ عێراق کە لە ١٩٧٤/٤/٢٤ بۆمباباران کرا و( ٣٥٤ ) کەسی تێدا شەهید بوو .

[٤] شنروێ : چیایەکە لە پشت هەڵەبجە کە لە ٤/٢٨/ ١٩٧٤ بۆمباباران کرا و زۆر بێ تاوانی تێدا بریندار و شەهید بوو .

بۆ شەهیدانی ( هەڵەبجە ) و ( قەڵادزێ )
خۆ هەردوکلا چارەنووسی
کەوتبووە ژێر
مرۆڤ وریستی سۆخۆی رووسی !! [٥]



بەڵێ کەویش
وەك زۆر سەرکردەی کورد وایە
ئەڵێن گوایە
زۆر لە مێژەوەیە ئەویش
( بەستە ) ی
کوێستانی بەفرین و کزەی بایە
هەردووکیان پێکەوە ژیاون
پەروەردەی یەك هەوار ئاون
بەڵام هەی داخ
ئاخۆ دەبێ
کامیان رێگای خیانەتیان
فێری ئەوی تر کردبێ ؟!
هەر کە هێلانەکەی رما
وەك شاری کورد
بوو بە سیخوڕ .. خێری نەما
ئەمیش لە قەفەزی حزبێکدا
بۆ دوژمنی خۆ بوو بە پرد !!

---

[٥] سۆخۆی : فڕۆکەیەکی جەنگی رووسی‌یە .

# وانەكانی مێژوو

١٩٨٠/٦/٢٤ ....

لە وانەكانی مێژوا
ماموٚستاكەم زوٚر جار ئەیووت
پێش هەزار و سێ سەد ساڵێ
كاتێ عەرەب
لە نیوە دورگەوە بزووت
وەك باڵداری تیژڕەو فڕی
وەك لافاوێ
بەربەستی پێشی ڕامالێ
هات ، تەخت و تاراجی (كیسرا)ی
لە كوردستان پێچایەوە..
دەستی زوٚردارانی بڕی
ئینجا ئاینی ئیسلامی
بوٚ كورد هێناوە كایەوە ..
مێژوو ئەڵێ :
ئەو عەرەبەی كە هاتبوو
ڕاستە ئەڵێن
چەك لە دەست بوو
بەلاٚم خوٚ ئەو خواپەرست بوو
تەنها ئیسلامی مەبەست بوو
قورئان لە دەستیا خەلاٚت بوو

بۆیە لە ناو گەلی کوردا
هەر مایەوە
وەك برایەك ژیا .. هەتا
لە ناویانا توایەوە



پێش لێدانی زەنگی پشوو
دوا هاتنی وانەی مێژوو
جارێك وتم : ئەدی ئەمڕۆ ؟
وتی : ووس بە !
پاشان بە گوێما چرپانی :
وتی رۆڵە
تۆی کەم تەمەن
کوا ئەزانی چۆن و بۆچی
مێژووی ئیسلام (تەعریب) ئەکەن ؟
من بیرم دێ
ئاگام لێیە
ئەمڕۆ عەرەب
کە بۆ ئەم کوردستانە دێ
بێ‌قورئانەو
چەکی تازەی رووسی پێیە
چونکە هەموو
وایان پێ رادەگەێنن ..
ئەورووپی پەروەردەی کردوون

تا نەخشەی وان راپەڕێنن ..
من بۆ خۆم مامۆستای مێژوم
ئەزانم ئەمانە چۆنن ..
تەنها زمانیان جودایە
ئەگینا هەر
ئیمپریالیزمەکەی کۆنن ..
وتم ئێستاکە دڵنیام
ئەمەی دێ بۆ داگیر کردن
دوژمنێکی دڕندەیە
دژ بە کوردە و دژ بە ئیسلام
بیستومە چۆن مزگەوتەکان ئەڕوخێنن ..
لە ( گەلاڵێ ) لە ( قامیشلی ) [1]
قورئانەکان ئەسوتێنن ..
وتی کوڕم ، قسەی تۆیە
بەلام رۆڵە چاوساغی وان
بزانە کرمی ناوخۆیە ..
هەڤاڵی کوردی ئەمڕۆیە ..
ئێستاکەش هەن
ئەڵێن بۆ کورد تێ ئەکۆشن
بەلام رۆڵە دڵنیا بە

---

[1] گەلاڵێ: دێیەکە سەر بە ناوچەی ماوەت / سلێمانی .
قامیشلی : شارێکی کورد نشینی سوریایە کە بەعسی سوری و بەعسی عێراقی قورئانەکانیان تێدا سوتاندن .

ئەوانیش وان

کورد و هەستیان گەلێك دوورن

گشت ( بابراك)ی ئەفغانین [٢]

جاشی سوورن

لە ئێستاوە بنکەی سەربازی ساز ئەکەن

هەر داهاتوو ئەیسەلمێنن

کە ئەمانەش

هەر وەکو پێرەکەی دوێنێ

لەویش زیاتر کورد فرۆشن

جا ئەبینی ئەوەك مزگەوت بڕوخێنن

وەکو مۆسکۆ ، وەکو سۆماڵ [٣]

نەك هەر قورئان

موسوڵمانی مەڵۆ کراوی وەك شارا

لە گۆڕەپانێکی شارا

ئەسوتێنن .

---

[٢] بابراك كارمل: سەرۆك كۆماری ئەفغانستان بوو کە سالی 1980بە پشتیوانی سوپای سووری رووسی کودەتایەکی کۆمۆنیستی کرد بەسەر سەرۆکێکی تری کۆمۆنیستی‌دا کە (حفیظ الله امین) بوو .

[٣] لە مۆسکۆ لە گۆڕەپانی سوور لە سالأنی ١٩٢٨ بە دواوە قورئانەکانیان کۆ ئەکردەوەو ئەیان سووتاندن و قورئان خوێن و مەلا و موفتی‌یەکانیان – دوای دوور خستنەوەیان – بە برسێتی ئەکوشت . لە (صومال)یش لە مانگی ١٩٧٥/٥ محمد سیاد بەری سەرۆکی کۆمار و سکرتێری پارتی سۆشیالیستی حوکمڕان فەرمانی دا پێنج زانای ئیسلامیان لە ناوەڕاستی شاری مەقادیشۆی پایتەختدا سووتاند . لەبەر ئەوەی بڕیارێکی سەرۆکیان سووتاند کە لە میراتدا پێچەوانەی ئیسلام ئەری کرد بوو!!

# موسەیلەمەی کورد [1]

۱۹۸۰/٦/۱۳ ...

کە شەقامەکان تەسك ئەبن
کەس ناوێرێ لە حەق بدوێ ..
کاتێ راستی ئەنرێتە بن
گشت خەڵکی زمانیان ئەسوێ ..
هەر موسەیلەمەی رووسێ و
بەرگی کوردی ئەکەنە بەر
کلێتەی سپاتی مەرەز
ئەکەنە سەر
هەر یەك لای خۆی دینێکی نوێ
بۆ (ئازادی) !
ئەم میللەتە دێنێتە دەر
بۆ سەرنج راکێشانی گەل
سرودی کوردی ئەخوێنن ..
لە ژێرەوەش بۆ پارە و پول
لە رۆژنامە و لە گۆڤارا
لە سەر مینبەر
شادە بە شانی کوفر دێنن ..
بێ شەرمانە بە ئاشکرا
لە ژێر گوڵینکەی کلێتە و

---

[1] موسەیلەمە : موسەیلەمەی کەززابی یەمەنی‌یە کە دوای کۆچی دوایی کردنی پێغەمبەر . صلى‌الله عليه وسلم . پروپاگەندەی پێغەمبەرایەتی بۆ خۆی دەکرد .

سێبەری ریشوەی مێژەرا
خوێن و مافی ملیۆنەها رووت و رەجاڵ
ئەنێنە چاڵ ..
بەلأم موسوڵمان ئەزانێ
بڵێ ئێوە
گەرچی بە رواڵەت سەرکردەن
بەلأم هەموو موسەیلەمەن
هەموو پێغەمبەری درۆن
خۆرەی ناوخۆن
وەك ئەژدیهان ، پێوە ئەدەن
وەك زەروون
خوێنی گەل ئەخۆن
ئەتانەوێ
کوردی بێ شوانی چاوەرێ
لە رێبازی ئیسلام لادەن
بیانخەنە سەر توولە رێ !
بەلأم خۆ دوێ
( گەلێ کەس هاتن بوون بە شوان
بوون بە شوانی مێگەل و ران
چون بە دڵسۆزی نەیلەوەران
دای بە گورگ ، دای بە قڕان ) [٢]
ئێستاکەش کورد
دڵنیایە ئێوەش هەر وان .

---

[٢] ئەم چوار دێرە هی شاعیرێکی ترن ، خوازراون .

# کوردایەتی و درۆ کردن

١٩٨١/٦/١٥ ....

تینوو تا ووشك بێ گەرووی
شێتی ئاوە
بۆیە هەتا تینی ماوە
هەر دەگەڕێ و وێڵە لە دووی
خەیاڵی ئاویش جار بە جار
لە مێشکیدا
وێنەی دەریاو روبار ئەکا ..
ئەوجا لە خۆشی و عەزرەتا
خۆی تێ داوێ
بەڵام چونکە درۆیەك بوو
سەرەڕای تینوو بوونی خۆی
سەرەڕای ماندوو بوونی خۆی
هەست بە ئێش و ئازار ئەکا ..
هەتا ئێستاش ئازادی کورد
هەر خەیاڵە
درۆیە ، قسەی بەتاڵە
کوردایەتیش .. گڕوگاڵە
جەردەیی‌یە ، تاڵانی‌یە ، ڕێ گرتنە
هەوەس پەرستی بێ هیوای
(مراهق)ی هەژدە ساڵە
خوێنی کورد وا بوو بە دەریا

بەردەوام ئاوەڕێژ ئەکا ..
چونکە هەریەك بە شێوەیەك
جووراوی وڵاتانی تر کاوێژ ئەکا ..



ئەڵێن ئەگەر ڕۆژ بگیرێ
تاریکی دێ
بەسەر ئاوایی شار و دێ
لە کوێ تروسکەی ئاگرێ
دەربکەوێ
خەڵکی ناچار
دەڕۆن و ڕوو دەکەنە وێ ..
کاتێ کوردیش
خۆری ئیسلامی خۆی گیرا
بۆ بینین و چارکردنی
برینی کوردی ڕەش و ڕووت
ڕێی ئاگری شەیتان گیرا
چونکە ئاگر هەر ئاگرە
(بوون)ی کورد بوو بە قەرەبرووت
چونکە (ئیلیاف) [1]
کوردایەتی
درایە دەست

---

[1] لی ری ئیلیاف : ئەندامی کنێست (پەرلەمان)ی ئیسرائیلە ، کە لە ماوەیەکدا ئاڵقەی پەیوەستی شۆڕشی کورد و ئیسرائیل بوو !

ئەویش لە (كنێست)ی جووا
برینی كورد سارێژ ئەكا ..



كە فێڵ و دووڕوویی و درۆ
بۆ هیوای خۆدەرخستن و سەركردەیی
دەبن بە هۆ
ئازادی و شۆڕشی بە تین
دەبنە شتێكی ئاسایی
كوردایەتیش
وەك كێشەی ونی فەلەستین
دەبێتە سەرچۆپی شایی
بۆیە ئەمڕۆ لە ناو كوردا
كارل ماركس ، وا خەریكە [٢]
كوردایەتی راوێژ ئەكا ..
(ماو) [٣] (ستالین) [٤] (ئەنوەر خۆجە) [٥]
بەرماڵی پێیە و نوێژ ئەكا .

---

[٢] كارل ماركس : دامەزرێنەری كۆمۆنیزمە ، لە ساڵی ١٨١٨ز لە ئەڵمانیا لەدایك بووە و لە ١٨٧٢دا لە بەریتانیا مردووە و بڕوای وایە كە پرۆلیتاری وڵات و نەتەوەی تایبەتی نیيە .

[٣] ماو تسی تۆنگ : سەركردەی شۆڕشی كۆمۆنیزمی چین بوو لە شۆڕشە رۆشنبیرییەكەی خۆیدا حەڤدە ملیۆن موسوڵمان كوژرا .

[٤] ستالین : نازناوی ( جۆزیف فیساریۆنۆفیچ دزوجاشڤیلی ) یە كە لینین پاش شۆڕشی ئۆكتۆبەری رووسیا پێی بەخشی . ستالین بە مانای مرۆڤێكی پۆڵایین . دڵڕەقترین و ستەمكارترین حاكمی روسیا بوو .

[٥] ئەنوەر خۆجە : سەرۆكی شۆڕشی كۆمۆنیزمی ئەلبانیا بوو . لە ماوەی یەكەمی حوكمیدا ( ٢١٦٩ ) مزگەوتی روخاند !

# نەورۆز

١٩٨٣/٣/٢١ ....

دەڵێن نەورۆز
بەسەرهاتی رووداوێکی رابوردووە
باسی پێکهاتنی بوونی
مێژووی گەلێکی زیندووە
بۆ مانەوەی سایەی (زوحاك)
مێشك پڕا
خوێنی هەزاران کورد رژا
ئەوجا کاتێ کە خوێنی وان
بوو بە (ورمێ)
بوو بە (سیروان) و بوو بە (وان) [١]
کاوە زمانی (بوون)ی پڕا
پاشان بۆ خاك
بە درێژی ساڵانی مێژوو
هەزاران کاسە سەری کورد
وورد و خاش بوو
تا بوو بە خاك
بوو بە چیا ، بوو بە (هەڵگورد) !
کەچی ئەمڕۆ

---

[١] ورمێ : دەریاچەیەکە لە کوردستانی ئێران . سیروان : رووبارێکە لە کوردستانی عێراق . وان : دەریاچەیەکە لە کوردستانی تورکیا .

هەزار (قەندیل) هەزار (گمۆ) [٢]

هاتوونە دی!!

دەزانن چۆن ؟ دەزانن بۆ ؟

چونکە لە ناو گەلی کوردا

سەدان زوحاك ئەژی !

جا کەوا بوو

لەدایك بوونی (نوێ)ی کاوە

هێشتا سەدان سەدەی ماوە !!



گەلی مردوو

چیتان دەوێ ؟

هێنانەوەی ئابڕووی تکاو؟

یا سەربەستی رای بزر بوو ؟

یا مافی ژینی چێنراو

کە سەوز نەبوو ؟

گەلی ئاساوی مەست و سڕ

تەمی ئاهی ژانی ئێوە

وەك پەڵە هەوری خەست و چڕ

زۆر جار گرتی رووی ئاسمان

زۆر جار سەریان بە یەکدا گرت

کۆ بوونەوە

بەڵام بێ بروسکەی خوایی

---

[٢] هەڵگورد ، قەندیل ، گمۆ : سێ چیان لە کوردستانی عێراق .

هەرچەند دانیان بە خۆدا گرت
رەوینەوە ..
چونکە بێ نرخە هەورو تەم
مادام نابێ بە لافاوێ
لە نێو خۆتان
هەڵکێشێ ریشاڵی ستەم ..



# ﴿ هەستانی شەو (قیام اللیل) ﴾

١٩٨٠/٦/١٣ ....

خوای میهرەبان
ئاگات لێیە ..
لەو کاتانەی نیوە شەوە و
خەڵکی ئەنوێ
هەر برایە دوور لە خەوە و
قورئانی پیرۆزی پێیە ..
هەتا بەیان
بە دەنگی زوڵاڵ پڕ لە گریان
تیا ئەخوێنێ
دار و بەرد ومردووەکانیش
کڕن ، بۆیان شل کردووە گوێ ..
هەردەم لە سوجدە سەر لە نوێ
ناوچەوانی دە جار ، بیست جار
لە خاك ئەخشێ ..
بەرزترین ئەندامێتی ، دێتە سەر خاك ..
هێمن دڵپاك
لەگەڵ خوای خۆی پەروەردگار
بە ئەدەب ئەدوێ
تا بە رەحمەت شەهید بوونی پێ ببەخشێ
هەتا سەربەرز تر بمرێ
بەڵکو لەگەڵ
پێغەمبەر و شەهیدانا
حەشر بکرێ ..

# منی بەندە

١٩٨٠/٦/٢٨ ....

ئەی خوای مەزن و بەخشندە
ئاگاداری
کە چۆن دڵی منی بەندە
هەر وەکو شەوێکی تاریک
رەش بووە بە تاوانکاری
بەڵام بە قەد ئاتاجی خۆم
بە قەدەر هەرچی زیندووە
هیوام ماوە
پەیوەستی بەندەیەتیشم نەپساندوە
لە ترسی زۆر کەمی تێشوو
هیوام ماوە
بە قەد بەزەیی تۆی زیندوو
گەرچی دڵی منی بەندە
بە قەد دەزویەکی باریک
بە خۆشەویستی تۆوە بەندە..
ئەمەش بەسمە
چون دڵنیام
لە رۆژی خۆی فریا رەسمە
بە (هارون) و (موسا)ت فەرموو
کە بۆ لای (فیرعەون)ت ناردن

ئاگادار بن
ئەو فیرعەونەی لە ستەمکاری دانا بوو
پەنا بە تۆ خۆشی لە جێی تۆ دانا بوو
نەبادا دڵی بشکێنن .
ئاگادار بن
( بە زمانی خۆش بیدوێنن
تا یاد بکات و بترسێ )[1]
ئەی ئیتر چۆن نەبێ کەسێ
وەك من کە تۆ پەرستی
بوو بێتە هۆش و هەستی
چۆن ئەفەرمووی بیهێنن
بەو دۆزەخەی
ساڵەهای ساڵە کڵپەی دێ
بیسووتێنن ..



[1] مانای ئەو ئایەتەیە « فقولا له قولا لینا لعله یتذکر أو یخشی » طه ٤٤

## ﴿ بۆ خوشكێكی سەرپۆش بەسەر ﴾

١٩٨١/١/٢١ ....

پێشکەشە بەو خوشکانەی سەرپۆشەکانیان بەربەرەکانێی نەفامی نوێ ئەکەن و وەك چیا لە رووبدا راوەستاون و نابزوێن ..
پێشکەشــە بە خوشکە پاڵەوان ( خوشکـە گێلاس ـــ دایـکـی بیـــــــلال ) و ( مهرەبان ) و ( مهاباد )ی خوشکم ..

بەڵێ خوشکم
منیش و تۆش
تووشی گێژاوی کوفر بووین
تیا بزر بووین
لێك دابڕاین ، لە یەكتر بووین
هەردوو وەکو مەستی بێ هۆش
یەکتری ناناسینەوە
چونکە ماندووین
بە دەست شەپۆلی ژینەوە
دیاردەی ئیسلامیمان نەما
لای من ریش و لای تۆ سەرپۆش ..



بەڵێ خوشکم

دەزانم تۆش وەکو منی

بگرە زیاتر

بەندی زنجیری دوژمنی

بەڵام خوشکە

ئەمە ئیسلامە ووریا بە

تا دڵ لە کوفر داخورپێ

دڵنیا بە

توند تر دەبێ

کۆتی بیرو زنجیری پێ ..

تا نەگۆڕێین

نەڵێین ( بیلال ) و ( زەنیرە ) ین [1]

هەتا مردن

مت بووی ئەو کۆت و زنجیرەین ..



بەڵێ خوشکی سەرپۆش بەسەر

تۆ زۆر تینت کەوتۆتە سەر

---

[1] بیلال : بیلالی حەبەشی یە . (زەنیرە)ش ئافرەتێکی کۆیلەی موسوڵمان بوو کە کافرەکان لە ژێر ئەشکەنجەدا هەردوو چاویان کوێر کرد ! ئەبوو بەکری صدیق . خوا لێی رازی بێت . کڕی یەوە و رزگاری کرد .

موسوڵمانی ئەم سەردەمەی

تۆ خواپەرستی ، سومەی‌یەی [2]

با بارانی تانە و تەشەر بترویننی

چاك بزانە

نەفامی زۆرت بۆ دینن

کەسێ نابێ ژینت بکرێ

سبەی شیری ئەبوو جەهلیش [3]

وورگت ئەدڕێ ..

گیانی پاکی ئەمری تۆش

وەك سومەی‌یە

وەکو گیانی خوشکە (بەنان) [4]

بەرە و باوەشی خوا ئەفڕێ ..



---

[2] سومەی‌یە: خێزانی یاسر کە بووە یەکەمین شەهید لە ئیسلامدا ، ئەبوو جەهل لە کاتی ئەشکەنجەدانیدا شمشێرێکی کرد بە سکی‌دا و کوشتی و بووە یەکەمین شەهیدی ئیسلام .

[3] ئەبوو جەهل : عەمری کوڕی حەکەمە و پێغەمبەر . صلى‌الله عليه وسلم . ئەیفەرموو : ئەبوو جەهل فیرعەونی ئەم ئوممەتەیە ، لە بەدردا کوژرا

[4] بەنان : کچی زانای موسوڵمانی سوریا (علي طنطاوي) وخێزانی مامۆستا ( عصام العطار ) بوو لە شاری ئاخن لە ئەڵمانیا بە دەستی سێ دڕندەی موخابەراتی سوریایی لە ماڵەکەی خۆیدا تیرۆر کرا .

بەڵێ تا تۆ (نوسەیبە) بی [٥]

ئەمە رێتە ..

هەتا تۆ (خەنسای) دایك بی [٦]

ئیسلام زیاتر هیوای پێتە ..

ئەوجا پاداشتی خوات دەبێ و

لە دنیاشا

پەڕەی دڵی ئێمە جێتە ..

هەمووش بە یەك دەنگ پێت ئەڵێین

مافی خۆتە .. پیرۆزت بێ

بەهەشتی خوا لە ژێر پێتە [٧]



[٥] نوسەیبەی کچی کەعب : یەکێکە لە ئافرەتە صەحابیەکانی پێغەمبەر (صلی‌الله علیە وسلم) کە لە غەزای ئوحود دا بە شمشێر بەرگری لە پێغەمبەر دەکرد .

[٦] خەنساء : ناوی (توماضری کچی حارث)ە . ئافرەتە صەحابی پێغەمبەر بوو . صلی‌الله علیە وسلم . لە جەنگی قادسیەدا چوار کوڕی شەهید بوو

[٧] پێغەمبەر . صلی‌الله علیە وسلم . بە صەحابی‌یەکی دەربارەی دایکی فەرمووی . خزمەتی کە . بەڕاستی بەهەشت وا لە ژێر پێ ی دا

## (حسب النبی)[1] پاڵەوان

.... ١١/٦/١٩٨٠

ڕۆژی ڕەشی ناسری بوو
کاتێ میسر
بەرگی بەری پۆشاکێکی ئاگری بوو
دەوری (قەلعە)ش - (باستیل)ێ بوو[2]
تینووی خوێنی گشت دیلێ بوو
وەکو هەژدە هەزاری تر[3]
ئەمیشیان گرت ڕاپێچ کرا
بە ڕاکێشان
بۆ زیندانی قەلعە برا
دوای هەڵواسین چەندەها جار
کە خوێن لە گیانی بێ وەستان

---

[1] حسب النبی خیرالدین : کرێکارێکی کارگەی ڕستن و چنین بوو لە شاری المحلە الکبری لە میسر - نەخوێنەوار بوو بەڵام شەرمی موسوڵمانی و پتەوی عەقیدە ئیسلامی‌یەکەی کردبوویانە مامۆستای برایانی موسوڵمان وەك جابر رزق ئەڵێت - کاتێك حسب النبی سزا ئەدرا - پێیان ئەوت ئیعتیراف بکە لەسەر ئەو کەسانەی تەنزیمیان کردوویت ئەویش لە وەڵاما ئەیوت : ئێوە گرگنی مۆمینن ( انتم اقزام من شموع ) چۆن من دڵم دێت برایەکی موسوڵمانی خۆم کە منی هێناوە بۆ ئەم خێرە ڕابکێشمە ئەم ئەشکەنجە و ئازارەوە

[2] قەلعە : یەکێك بوو لە زیندانەکانی میسری ناسری . باستیل : زیندانی گەورەی فەرەنسا بوو - شۆڕشگێڕەکانی فەرەنسا ڕماندیان .

[3] جمال عبدالناصر خۆی لە لینینگراد ووتی کە لە یەك ڕۆژدا هەژدە هەزار کەس لە اخوان المسلمین گیراون .

زەنگوڵ زەنگوڵ ئەهاتە خوار
رووی تێ کردن :
کە من نزام
لە سوجدەی نوێژی شەوانا
گشت جار تکام
لەگەڵ صەبای صاڵحانا [1]
شەهادەت بێ
چۆن ئەتوانن
ئێوەی دوژمن
ئێوەی درِندە . دڵرِەق . زۆردار
کە بە لێدان هەوڵ ئەدەن
نامێری ئەشکەنجەو ئازار
ئەما ئەتان خستبێتە کار
کەچی هێشتا دەسەوسانن
ئەتان توانی و ناشتوانن
ئیعتیرافێکم پێ بکەن



شەرم بکەن
ئێوەی دوژمن
بە گشت شێوە ئەتان توانی
ئیرادەی ئیسلامەتی من نەرم بکەن
چۆن ئەتوانن
ئێوەی دوژمن
ئێوەی گرگن

---

[1] صەبای صاڵحان .مەبەست لە بەری بەیانیانە

گرگن لە مۆم
کە تائێستا نەتان توانی
کەرسەکێکی قەڵای باوەڕم وورد بکەن
ناشتوانن هەتاکو هەن
رازێکم پێ بدرکێنن
ئیتر بۆچی هەوڵ ئەدەن
بەردی بناغەی قەڵاکە بڕوخێنن
باوەڕی دامەزرازی دڵ دەربهێنن .
من خۆم ووتم :
هەموو نزام
لە سوجدەی نوێژی شەوانا
گشت جار تکام
لەگەڵ صەبای صاڵحانا
شەهادەت بوو .
کەوا بوو زۆر گەوجێتی‌یە
بێ مێشکی‌یە
من بە مردن بترسێنن
ئێستاکەش من
رەنجی ئێوەم وەها دێتە خەیاڵێ
وەك گامێشێ
کە گوێ نەدا بە هیچ ئازار و ئێشێ
بە قۆچ لە ئەهرامەکان دا [*]
بەو هیوایەی رایان ماڵێ ..

---

[*] ئەهرام : بریتی‌یە لەو کۆشکە بڵند و گەورانەی فیرعەونەکانی میسر دروستیان کردووە و ئێستاش وەك خۆیان ماون .

# مەروان حەدید[1]

١٩٨١/٤/٢٧

دەزانن بۆ مەروان حەدید
پەت نائێنرا لە گەردنی ؟
چونکە پڕ بە دەمی دەیووت :
بۆ سەندنی
مافی خوراوی رەشوڕووت
( یا گوێم لە دەنگی فیشەك بێ
یا دەستان مەشجەبی چەك بێ )[2]



لە بیرتانە پێی دەووتن :
لە رێبازی خەبات کردن
قۆناغ نی‌یە
موسوڵمان پێی بڵێ سرەوتن
مەگەر مردن ..
بیرتانە دەیووت کە دەڵێن

---

[1] مەروان خالد حەدید : دامەزرێنەری کۆمەڵی ( الطليعة المقاتِلة للإخوان المسلمين ) ی سوریایە . سالی ١٩٣٨ ز لە شاری سەربەرزاوی (حەماە) ی سوری لە دایك بووە . هەنگری بڕوانامەی کۆلیژی کشت و کاڵی قاهیرە و کۆلیژی ئاداب بەشی فەلسەفەی دیمەشق بوو . ساڵی ١٩٧٠ شەهید کرا . دوای ئەوە سەرەنجامی سزاو ئازاردانی لە ناو ژووری پڕ ئاوی بە کارەبا کراودا . گۆشتی پارچە پێکانی لێ بوونەوە و نینۆکەکانی هەڵ کێشران و زیاتر لە (٣٠) سی کیلۆگرامی کێشی لە زیندانا کەم بووەوە

[2] دەقی قسەی خۆیەتی : ( إذا اردتم نصر الإسلام فسمعوني صوت الرصاص )

ڕێبازی خواییمان دەوێ
هەم سەلماندنی بوونی خۆ
هەم ئیسلام دەبێ سەرکەوێ
با گوێم لە دەنگی فیشەك بێ
با دەستان مەشجەبی چەك بێ ..



لەبیرتانە بۆچی دەیووت :
براینە
ئارامی مەردی زیندانی
لەسەر سزاو ئازار دانی
کۆتا پلەی نەبەزینە
بەڵام خۆگرتنی ( سەربەست)!
لەسەر ئەشکەنجەی زەلیلی
لەسەر نۆشی تاڵی دیلی
لە عەقیدە دابەزینە ..
لەسەر ستەم خۆ مت کردن
شێوازێکی خۆکوشتنە
گەرچی سەرزارەکی ژینە ..
دە تا مردن
بۆ پاراستنی ئەم دینە
با گوێم لە دەنگی فیشەك بێ
با دەستان مەشجەبی چەك بێ ..



براكانم

وەك بزانم

هەموو ئەوەتان لە بیرە

كاتێ دەیووت :

( یطربنی بأنغام رصاص

ینعشنی فما أحلی عبیره )[3]

ئێوەش هەموو دەبێ وا بن

چونكە فیشەك

كلیلی كۆت و زنجیرە ..

بۆن و تۆز و خۆڵ و باروت

وەكو زیندان

ئەویش مایەی گەشەی بیرە

خۆ بەهەشتیش

گشت دڵنیاین

وا لەبەر سێبەری (شیر)ە[4]

دە تا ئەو كاتەی لە دنیاین

با گوێم لە دەنگی فیشەك بێ

با دەستان مەشجەبی چەك بێ ..



---

[3] لە قەصیدەی ( المقاتل المسلم ) ی خۆی وەرگیراوە

[4] پێغەمبەر (صلی‌الله علیه وسلم ) دەفەرموێ : ( اعلموا ان الجنة تحت ظلال السیوف)



# ئەی پێغەمبەر ﷺ

١٢/ربیع ١ / ١٤٠٠ ك   ١٠/٢/١٩٨٠ز

پێشکەشە بە یادی ١٤٥٣ ساڵەی جەژنی لەدایك بوونی (محمد)ی پێشەوامان ( صلی‌الله علیه وسلم ) .

ئەی موحەممەد
ئەی نێرراوی خوایەتی
پێغەمبەری مەردایەتی
لە یادی لە دایك بوونتا
ئەی پێغەمبەر
هەتا ئەبەد
هەزارەها .. ملیۆنەها
درود و سڵاوی خوات لەسەر ..



ئەی پێغەمبەر
ئەی خواپەرستی دادپەروەر
ئەی ئەو کەسەی وا زوو توانی
سەرباز و شوێ کەوتوانی
بە رێبازی ئەم پەیامە
بە بانگەوازی پیرۆزی ئەم ئیسلامە

دڵنەرمانە پەروەردەکا
وەك نموونەیەکی قورئانی



ئەی پێغەمبەر
رێ پیشاندەری کۆڵ نەدەر
ئەی ئاشتیخوازی مرۆڤ ویست
ئەی ئەو کەسەی
وەك نموونەیەکی خوا پەرست
لەو جێگایەی ستەم ئەکرا
کە مافی چەوساوەکان ئەخورا
کە هاواری رەش پێستەکان سزا ئەدرا
کاتێ قەرزار
مۆری کۆیلەیی پیا ئەنرا
کاتێ هەژار
بە زۆرە ملی رەنجی ئەبرا
لەو کاتەدا
لە رەهێڵەی شەوی کوفرا
ناڵەی هەزار هەژارت بیست



ئەی پێغەمبەر
نموونەی خواناسی رەنجدەر
سەرکردەکەم
فەرماندەکەم

ڕۆژانی ڕەشی جاهیلی وا هاتەوە
خەڵاتەکەت
کە جێگیری دڵ و دەروون بوو
قورئانەکەت
کە کانیاوی سازگاری
ڕێبواری دەشتی بێرون بوو
لە دڵی هەر یاوەرێکا
ببووە بڵێسەی ئاگرێ
گشت کەس ئەیووت
وا بڕوا زەمین دائەگرێ
کەچی ئەمڕۆ
چونکە دوورین
لە ڕاستی ڕێبازەکەی تۆ
باوەڕی زۆربەی موسوڵمان
وەك ژیلەمۆ
چاوەڕوانە کەسێ فووی پێدا کاتەوە
بەڵێ ئەمڕۆ
ئەمڕۆ لەسەدەی بیستەما
نەك ئەوەندەی لە دەروونا
کاری نەما
لە تاقی مزگەوتەکانی
(شاناخسێ) و (سەفرە)و (زەروون)ا[1]

---

[1] شاناخسێ : دێیەکە سەر بە ناوچەی سیوەیل سلێمانی

خۆڵەمێشەو

کەسێ نی‌یە کۆی کاتەوە ...



ئەی پێغەمبەر

نێرراوی خوایی مژدەدەر

ئەی رابەری پەیامەکەم

پێغەمبەری ئیسلامەکەم

من دەنگێکم بیستراوم

لە دوورەوە

دەنگێکم دێم

لە وڵاتی سەد سنوورەوە

گوێم لێ بگرە

رۆژ ژمێرەکەم ئەخوێنمەوە

هەواڵەکان

دوو جار ، سێ جار ئەڵێمەوە ..



هەواڵی یەکەم

**لە کوردستانی بێ شوانی عێراقەوە .**

منداڵێکی پەرتەوازەی بێ پەل وپۆ

گشت کوردستان

---

(سەفرە) و(زەرون) : دوو دێی سەر بەناوچەی ماوەت سلێمانی

لە (ژەنگار)ەوە تا (بەمۆ) [٢]
گەڕا لە دووی
باوکی هەژاری بزر بووی
تا سەرەنجام
لە پشت گمۆ [٣]
دۆزیەوە لەگەڵ کاروان
دوای سەربڕین
قەل خوارد بووی ..
داهاتەوە
ئێسکی وورد بووی
کۆ کاتەوە
وەك دیاری‌یەك
بۆ(مەجمەع)ی بینێتەوە [٤]
لە پڕ کۆمەڵێك دەست بە چەك
ژەندرمەی چەپەڵی عەفلەق
هەر بە ناهەق
لەشی ئەویشیان بە فیشەك
ھارد کردەوە
جیا بە دەم پێکەنینەوە
ووتیان تۆش بڵێ لەو دنیا

---

[٢] ژەنگار : سنووری رۆژ ئاوای کوردستان عێراق ، بەمۆ:ش رۆژهەلاتیتی .
[٣] گمۆ: چیایەکی بەرزی کوردستانی عێراقە لە ناوچەی سیوەیل سلیمانی
[٤] مەجمەع : مجمع : بریتی‌یە لەو کۆمەڵە خانوانەی رژێمی بەعس لە کوردستانی عێراق دروستی کردن و بە زۆر کوردە گوندەکانی سەر سنووری کوردستانی دەگواستەوە بۆیان



هەواڵی دووەم

## لە ئەفغانستانی خوێناوییەوە

٢٧ی دوانزەی حەفتا و نۆ
ئاژانسەکان
رایان گەیان
کە ئەمڕۆ گەلی ئەفغانی
دەمەو بەیان
کاتێ لە ماڵ هاتنە دەرێ
وەکو جاران
بینیان وا
لە ناو جەرگەی (قەندەهار)ا [٥]
رێوییە سوورەکانی مارکس
دوای(سەمەرقەند)و(بوخارا) [٦]
هاتن هیلالی مزگەوتیان
وەك شێت و هار
سەر بەرەو خوار

---

[٥] قەندەهار : یەکێکە لە شارە گەورەکانی ئەفغانستان

[٦] سەمەرقەند و بوخارا : دوو ویلایەتی ئیسلامی گەورە بوون ، بە زۆر خرانە ژێر دەسەلاتی حکومەتی کۆمۆنیستی (روسیا شورەوی )

کرد بە دارا ..

پاشان تانکی (تی ٦٢)

ئاڵای سووری چەکوش و داسی

هێناو بە دەرگای مزگەوتا

هەڵی واسی ..



### هەواڵی سێیەم

### لە ئۆگەندەی بێ کەسی چەوساوەوە [٧]

گوێتان لێ بوو .. لە کەمپالا

لە منارەی مزگەوتەوە هاوار کرا

ووتیان دیسان

کێشوەری رەش ئازار درا ؟

یان نەتان بیست ؟

نەشتان پرسی

ئەفریقی رەش پێستی برسی

بۆ وا ئەکەن ؟!

من گوێم لێ بوو

ئاهو نزوولەی دیلێ بوو

هاواری کرد گەر تێم ئەگەن

ئەوانەی وا لە ئەفریقا هاوار ئەکەن

---

[٧] ئۆگەندە : وڵاتێکی هەژاری ئەفریقاییە ، پایتەختەکەی (کەمپالا)یە .

براتانن
موسوڵمانانی ئۆگەندەن !!
زریکەی ژنی جێ ماوە
قیژەی کۆرپەی سەر بڕاوە
ئاهو نووزەی پیری سەد ساڵ
وێرانە ماڵ
پەڕاوەزە و سەرلێ شێواو
ملیۆنەهان .. کۆمەڵ کۆمەڵ
بە زیندوویی ئەنرێنە چاڵ
خۆم گوێم لێ بوو ئەیزریکان
کەی پێم ئەگەن ؟
کەی تێم ئەگەن ؟
ئەوانەی وا لە ئەفریقا هاوار ئەکەن
براتانن
موسوڵمانانی ئۆگەندەن ..
ئەوانن وا لە تاو سوتان
بۆ ولاتانی دراوسێ
(چاد)و(سودان)
پەنا ئەبەن ..
هەر لە (سودان) ژمارەیان
هەشتا هەزار پەناهێندەن ..
گوێم لێ بوو پێش ئەوەی بمرێ
دەنگی زولاڵی کپ بکرێ
بە رووی جیهانا قیژاندی

موسوڵمانینە كوا دەستان ؟
بگرێ بەری خاچ پەرستان ..
كەوا بە خوێنی ئۆگەندی
وەك ئەندەلوس
وەكو قودس
لافاوی خوێنینیان هەستان ..
راپەڕیم قیژاندم برام
كێ بێ هاوار و بانگی تۆ
تۆی بێ شوان ، بێ كەس ، رەنجەڕۆ
بێنێتە لام
كێ بێ ئاگای لەو ژیانە تاریكەت بێ
هەزارەهای وەك من مەگەر
ئاوا لە گۆشەی خەونێكا
گوێی لە دەنگی زریكەت بێ ..



**هەواڵی چوارەم**

**لە سوریای نەبەز و كۆڵ نەدەرەوە**

ئەمجارەیان ماركسیزم
كینەی سووری
لە (تەدمور)دا [٨]

---

[٨] تەدمور : زیندانێكی گەورەیە لە بیابانی تەدمور لە سوریا ، یەكێكە لە زیندانە بەناوبانگەكانی جیهان  لە ماوەی دوو سەعاتدا (١٠٨٦) موسوڵمانی تێدا شەهید بوو كە بە فڕۆكە ( هەواپەیما )ی هیلیكۆپتەر لێدران

لە خاکی پیرۆزی سووری

لە دایك بوو ..

لە باوەشی رق و قینا

لە دڵی (نوصەیری) بێ دینا

لە دایك بوو ..

لە سەر رانی فرۆشیاری

کێشەی وونی فەلەستینا

لە دایك بوو ..

ئەمجارەیان

هۆلاکۆ هاتە سەر (حەما) [٩]

نەك بە رم و شمشێر وتیر

بە (راجمە)

دیجلەیەك دروست بوو بە خوێن

ئەوەك دەست نووس

ئابڕوو تکا

قورئان نەما

هەزاران خوشکی داوێن پاك

لە ترسی ئابڕوو چوونی

لە تاو ئازاری دەروونی

هاوار ئەکەن :

( وا محمداه .. وا اسلاماه )

هاوار ئەکەن

---

[٩] حەما : سێیەمین گەورەترین شاری سوریایە لە مانگی٢/ 1982 زیاتر لە ( ٤٢٠٠٠ چل و دوو هەزار ) کەس لە دانیشتوانی شەهید کران . دوای ئەوەی شۆڕشی ئیسلامیان بەرپاکرد . (٨٨) مزگەوت و (٤) گەڕەکی بە راجمە ( موشەك ) تەخت کران .

تو خوا وەرن هێرش بێنن ..
زیندانەکان
بەسەرمانا بڕوخێنن !!
هاوار ئەکەن :
توخوا موسوڵمانی جیهان
چارەسەرێ ..
ئێمەی خوشکتان
ڕوومان نەما بێینەدەرێ ..
ئێمەی کڵۆڵ
ئێمەی زگ پڕ لە کۆرپەی زۆڵ
چۆن بێینە دەر
فتوا بدەن خۆ بکوژین
نەك پاشان زۆڵ
بگرینە کۆڵ !!
توخوا زووتر هێرش بێنن
بۆ پاراستنی ئابڕوو
زیندانەکان
بەسەرمانا بڕوخێنن ..[10]

---

[10] ئەم هاوارەیان لە نامەیەکدا نارد بۆ گۆڤاری ( الاخبار) کە یەکێتی ڕێکخراوە قوتابییە ئیسلامییەکانی جیهان دەری ئەکەن و بڵاو کرایەوە ..

# له زیندانا

١٩٨٣/١١/٢٣

پێشکەشە بەو براو خوشکە موسوڵمانانەی کە لە زیندانەکانی ستەمکاراندا ئازارو لەشکەنجە ئەچێژن .

بەڵێ دوژمن
ئەتوانی هەزاری وەك من
بە یەك راپۆرت
تووشی ئەشکەنجە و سزاکەی ..
لە زیندانا
لە ژێر زڕەی زنجیر و کۆت
لە ژێر ئۆف و ئێش و ژانا
زۆریان لێ کەی
سەدان ئیفادە ئیمزا کەن
لە دەرەوەش
لاوازەکان
لەسەر مینبەر بۆت نزا کەن
بەڵام ئایا عەقیدە و بیر
دەفەوتێ بە کۆت و زنجیر ؟!



بەڵێ دوژمن
ئەتوانێ هەزاری وەك من
دەست و پێی كۆت و زنجیر كەی
لەگەڵ ژانا
لاوی لە زیندانا پیر كەی
لەوەش زیاتر
زمانی خۆشی لە بیر كەی
بەڵام ئایا
كاروانی ڕێگەی خواوویستی
بە ڕای ئێوە
دەمرێ و ناگاتە مەبەستی ؟



بەڵێ دوژمن
ئەتوانێ هەزاری وەك من
لە زیندانا بتاسێنێ
چاوی هەزارانی تریش
بترسێنێ
دەشتوانێ
بە هۆكانی ڕاگەیاندن
وەك (خائن) یش
بەم خەڵكەیان بناسێنێ

بەلام خۆ خەڵكی دەیزانی
ئێمەی پەروەردەی قورئانی
ئێمەی خواوویست
لە ژیانا
غەیری ئازاد بوونی میللەت
هیچمان نەویست
بەو هیوایەی لە قیامەت
خۆ رووسوور کەین
لەبەر دەمی خوای خۆشەویست .



# شەهید

.... ٢٩/ رەمەزان/١٤٠١

پێشکەشە بە گیانی پاکی ا حمد الله و علی حسین و براکانی تـرا کـە لـە ٢٧ی ڕەمەزانی ١٤٠١ك لە بەغدا لە سێدارە دران وهەندێکیشیان لـە ژێـر ئەشـکەنجەدا شەهید بوون . پاشان تەرمەکانیان لــە شـاری نەجـەف بـــە نهێنـــی لــە لایـەن بـەڕێوەبــەرێتی ئاســایشــی گشـــتی ( الامن العامە ) وە بە خاك سپێرران !!

شــەهــیــدی لـــە ســیـــێدارە دراو
ئـــەی دوور لـــە دەنـــگ لـــە چـاڵ نـــراو
لیـــرە بـــە عـــەقیـــدە ســەرکـــەوتی
لـــەوێش خـــوای خـــۆت بینـــی بـــە چـاو



دەبێ ئێمــە بـۆچی بـۆ شــەهید بگــرین
کـە دڵنیـایـن هــەمــوو هــەر دەبێ بـمریـن
خوێنی شەهید گەر گشت گوناهێ بسڕێ
ســتەم نییە گــەر ئــەو ڕێگـەیە نەگـرین ؟



دنیـا بـا بـە جــووت لێـك بچـریـکێنـین
زینــدووی ســـەر زەمـــین تـێ بگـــەێنین
لـە پـەیمـانـەکـەی کـە بـۆ خـوا بەسـتمان
شەهید بوون یا ( ژیـن ) بەدەسـت بهێنین

# سرودی نوێ بۆ نەوەی نوێ *

١٩٨٠ ٢/١٩ ....

مـــن نـــەوەی نـــوێی ئـــەم ئیســـلامەم
بـــڕیـــارم داوە هـــەتـــا هـــــــەم
لـــــــە ڕێبـــازی ئـــەم ئیســـــلامە
بم جنـــن ، بم کـــــوژن ، لانـــــادەم



من نەوەی نـوێی چـەك بـە دەسـتم
هـــەر جیهـــادە هـــۆش و هـەســـتم
دوا زینـــدەی ئـــەم ســـەر زەمینـــە
نـەبـــێ تـــێ بگـــا مـەبـەســــــتم



مـــن نـــەوەی نـــوێی خـــاوەن تینـــم
بـــە عـــەقیـــدەی پـــۆڵایینـــــــم
گەر خوا حەزکا دوای چەند ساڵێ
حـوکمـــی ئیســـــــلامی نەبینـــم



مـــن نـــەوەی ڕێی قـــورئـــانـــــــم
بـــــەو چـەکـــەی کردوومـــە شانـــم
پـاســـەوانـــی ئـــەم ئیســـلامـــەم
تـــا دوا هـــەنـــاســـــەی ژیـــانـــم

---

* ئاوازێکی شۆڕشگێڕی بۆ دانراوە .

# سەربازی نوێ

١٩٨٠/٢/٢٢ ....

سەربازی نوێی ڕێبازی ڕێین ، ڕێی ئازادی
جیهاد ئەکەین تا ئاواتی گەل دێتە دی

هەزار هەزار سێدارە دانرێ
یەك لە دووی یەك گەردنی پیا کرێ
تینی کڵپەی شۆڕشی ئیسلامەتی
وا لە برەو زیاد ئەکا و دانامرێ

سەربازی نوێی ڕێبازی ڕێین ، ڕێی ئازادی
جیهاد ئەکەین تا ئاواتی گەل دێتە دی



هێزی دوژمن هەموو ڕێگا گرێ
دەشت و دەرو چۆڵ و چیا گشت داگرێ
تینی کڵپەی شۆڕشی ئیسلامەتی
نەبێ شاڵاوی نەفامی ڕاگرێ

سەربازی نوێی ڕێبازی ڕێین ، ڕێی ئازادی
جیهاد ئەکەین تا ئاواتی گەل دێتە دی



هەموو ڕێگەی ژیان بەربەست کرێ
لافاوی خوێن وەك جۆگەلە هەڵبەسترێ
ئالای بەرزی شۆڕشی ئیسلامەتی
وا بە لاوان تا ئەبەد دانانرێ

# موسوڵمانین *

١٠ موحەڕڕەمی ١٤٠١ ك

موسوڵمانین　　موسوڵمانین

پەروەردەمــــان قورئانیـیـە　　بۆ دین گیانمان قوربانییە
سەرکردەمان موحەممــەدە　　کـە نێرراوی یــەزدانیـیــە

ئێمــــەی موســـوڵمـــانی نــــوێ
بــــۆ ئـاواتــــێ کـەوتـــوینە ڕێ
تـا دوا تکـەی خوێنـــی گەشمـــان
دابـــین نابـــین تـــا دێتـــە جێ

موسوڵمانین ... موسوڵمانین

پەروەردەمــــــان قورئانیـیــــە　　بــۆ دیـــن گیانمـــان قورئانیـیـــە
ســـەرکردەمان موحەممـــــەدە　　کــــە نـــێرراوی یـــەزدانیـیـــــە

پەیمـــان ئـەدەین ئـەم ئیسلامـــە
بـــۆ ژیـــن بکـەینـــە بـــەرنـامــە
دڵنیـــاین سوتـــــەمەنـــی (ڕێ)ش
جـۆگـەلـــــەی خوێنینـــی زامــە

---

* ئاوازێکی شۆڕشگێری بۆ دانراوە .

موسوڵمانین ... موسوڵمانین

پەروەردەمـــان قورئانی‌یـە بۆ دین گیانمان قورئانی‌یە

سەرکردەمان موحەممـەدە کـە نێرراوی یـەزدانی‌یـە

باهـەر زیـاد کـا هـێزی دوژمـن

حوکـم کـا ئـاگـر و ئاسـن

هـەر سـەدای بـانگی جیـهادە

لــە گـوێمانـایە تـا مـردن

موسوڵمانین ... موسوڵمانین

پەروەردەمـــان قورئانی‌یـە بۆ دین گیانمان قورئانی‌یە

سەرکردەمان موحەممـەدە کـە نێرراوی یـەزدانی‌یـە

وا شـەهیدی ئـەم پـەیامـە

کـاروانـی هـەر بـەردەوامـە

دەی با ئێمەش شوێنیان کەوین

ئـەی ئـەوەی ئـاین بـرامـە



# ﴿ هەتاکەی ﴾

١٩٨٢/٩/١ ....

بـــرای مـــوســـوڵمـــان هـــەتاکـــەی
بـــەرهـــەڵستی کـــوفـــر نـــاکـــەی
وا میللـــەت خـــوێنـــاوی خـــورا
پێویســـتە شـــۆڕش بـــەرپـــا کـــەی



وا ســـەرجەمـــی هێـــزی دوژمـــن
چـونکـــە تـــۆ نیـت زۆرتـــر ئەبـــن
تـــۆ نـــەمانـــت شـــەهیـــدی بـــێ
شـــەرمـــە بترســـی لـــە مـــردن



ئـــەوا کـــوفـــر هـــەرچێـــکی بـــووی
خستیە خـــەبات و چـــور لـــە دووی
کـــە تـــۆ لـــە گێـــژاوی خـــەودای
چۆن دەیســـەلمێنی کـــە زینـــدووی؟



تاکـەی موسـوڵمان خـۆ هـەر تـۆی
دوژمـــن ئیســـلام بـــاس بکـــا بـــۆی
دە رەببـــی ئـــەو چـــاوە کوێـــر بـــێ

کە ناناسێ دوژمنی خۆی



دوژمن بە گیرفانی پڕی
وا باوەڕی خەڵکی کڕی
هەموو میللەتی دا بە قڕ
تۆ هەتا کەی ڕاناپەڕی ؟



تۆش چەوساوەو دڵ تەزیوی
لە ژێر ستەما ڕزیوی
بۆ سەلماندنی بوونی خۆت
هەستە بەسە دڵ بەزیوی



خۆ تۆش بەندی زیندانە جێت
خۆ تۆش کۆت و زنجیرە پێت
دە هەتا کەی ڕاناپەڕی
کە خوا وا پشتیوانت بێت



# هاوار بکەن *

١٩٨٢/١٠/١ ....

ئـەی نـەوەی جیـهادی نـوێ
یـەکتریتـان خـۆش بـوێ
قورئـان و چـەك هـەڵگـرن
تاکـو ئیسـلام سـەرکەوێ

چـەندی خـواتـان خـۆش دەوێ
هـاوار بکـەن : اللـه اکـبر

مـەشـخەڵـی رێ هـەڵگـرن
وەك پڵنـگ هـەڵمـەت بـەرن
بـا وشـەی خـوا سـەرکەوێ
یـان لـە پێنـاویـا مـرن

دەی چـەنـدەی دژی کـافـرن
هـاوار بکـەن : اللـه اکبر

راپـەڕن دەی راپـەڕن
وەك پڵنـگ هـەڵمەت بـەرن
تـا دوا هـەناسـەی ژیـان
دەنگـی قـورئـان هـەڵبڕن

---

* ئاوازێکی شۆڕشگێڕانەی بۆ دانراوە

بــه کــوێــری چــاوی دوژمـــن
هــــاوار بکـــەن : اللـــــه اکبر

تەنـها ڕێی خواوویســتیيە
ســـوز و خۆشەویســـتیيە
هـــەرچـــی ڕێبـــازی تـــرە
زوڵـــم و خـۆپـەرســتیيە

کــێ عـەشـقی سـەربەســتیيە
هـــــاوار بکـا : اللـــه اکبر

ڕاپـــەڕە ئـــەی مـاف خوراو
هـەستە ئەی پێشــێل کــراو
سەر لە نوێ بە خوێنی خۆت
ڕادە میــــخ و بێخــــی داو

وەك بیـلال بــوون بێنــــه نــاو
هــــاوار بکـــەن : اللـــه اکبر



# باکۆبین *

.... ٢٢ ٦ ١٩٨٠

با کۆ بین دەی دەست لە نێو دەست یەك گرین
گشت لە ناو خۆمان بەڵێن لێك وەرگرین
نەك ( ابطَح ) لە ژێر پۆشاکی ئاگرین
وەك بیلال بین دڵ نەبەز بین خۆ گرین
چونکە ئێمە موسوڵمانین برای وین
بەیعەتمان دا ئالای قورئان هەڵگرین
کێیە تامەزرۆی شەهیدی زووکا تۆمار کا ناوی
با بێ خەم بێ خوا ئەمێنێ بۆ منالی جێ ماوی
دەی وەرن کۆ بین بەڵێن بۆ خوا بەستین
چونکە ئێمە خاوەن یەك سۆز و هەستین
تا بڕیار دەین هەموو بە جارێ هەستین
بڵێین دوژمن ئێمە کە خوا پەرستین
خۆمان عەشقی شەهید بوونین جا ئیتر
هێزت با گشت جیهان بێ چ دەربەستین
کێیە تامەزرۆی شەهیدی زووکا تۆمار کا ناوی

---

* ئاوازێکی شۆڕشگێڕانەی بۆ دانراوە

با بێ خەم بێ خوا ئەمێنێ بۆ منالّی جێ ماوی

دەی وەرن کــۆ بیــن بەلّیــن دەیــن ویکــڕا

یەك دلّ و یــەك ئــاوات و یــەك پـــرس و را

تــێ بکــۆشین کــەس نــەلّــێ نانــم بــڕا

نــەك لــە زینــدانــا لــە نــاو جەرگەی گــڕا

هــاوار کــا : ســوورم لەســەر قــورئانەکەم

تــا دەلّیــن کــوفــر ئــەمــا گــوێچکــەی دڕا

کێیە تامــەزرۆی شــەهیدی زووکــا تۆمــار کا نــاوی

با بێ خەم بێ خوا ئەمێنێ بۆ منالّی جێ ماوی



# من کێم

١٩٨٠٠٢٠١٢ ....

**لە سەرەتای قۆناغی زانکۆمەوە گەلێک لە شەیتانەکانی کۆمۆنیزم و ئاڵقە لە گوێکانی بەعس ئەکەوتنە شوێنم و لەیانپرسی کە ئایا ریشم بۆ چ رێبازێکم هێشتوتەوە ؟! ئەم چەند دێڕەی خوارەوە پێناسەیەکە و بە رای من پێویستە ببێتە ناونامە (هەویە) ی لاوانی موسوڵمانی کورد .**

دێی و دەتنێرن گەلێکن دێنە رێم
دێن و لەمولاولا دەپرسن چیم و کێم
تا ئەوان هەن با هەڵگرن شوێنی پێم
بەردەوامم من بۆ ئەم ئیسلامە دێم
یا سەرەنجام سەرکەوتنێك دەست ئەخەم
یا لە رێیا وەك سەیید خۆم دادەنێم[1]
من ئەو دەنگە دلێرەم دوژمنم تۆقیوە لێم
دەنگی قورئانم سرودەکەی (بەننا) ئەڵێم[2]
خوا مەبەستمە و پێغەمبەریش پێشەوام
قورئانە دەستوورم جیهادیش رێی هیوام
عاشق و شەیدای شەهید بوونی رێی خوام
بە هەڵمەتم وەك پڵنگی بێشەوام

---

[1] سیدقطب : زاناو رۆشنبیر و موجاهید لە ١٩٠٦ز دا لە میسر لەدایك بووە و لە شەوی ٢٩٠٨٠١٩٦٦ دا لە سێدارە درا ، نوسەری (في ظلال القرآن و معالم في الطريق و معركة الإسلام والرأسمالية ، و خصائص التصور الإسلامي و ... هتد ) ە .

[2] بەننا : پێشەوای شەهیدە : حسن البنای دامەزرێنەری برایانی موسوڵمان ( الإخوان المسلمون ) لە ساڵی ١٩٠٦ دا لە دایك بووە و لە ١٩٢٨ دا ئەو تەنزیمەی ئیخوانی دروست کردووە . لە ١٢ ٢ ١٩٤٩ دا ترۆر کرا . سرودەکەشی ئەمە بوو : ( خوا مەبەستمانە ، پێغەمبەر پێشەوامانە ، قورئان دەستورمانە ، جیهاد رێمانە ، مردن لە پێناوی خوادا گەورەترین هیوامانە )

خوای مەزن پشت و پەنامە و (مؤمن)م[٢]
دڵنیام سەرکەوتنە مافی ڕەوام
وا ئەمناسن دوژمنم بۆیە تۆقیوە لێم
برای (حەمزە)م حەز ئەکەم لە مەیدانا گلێم



بەیعەتە بۆ رابەری ڕێبازەکەم
هەر وەکو خۆی خۆم بۆ شۆڕش سازەکەم
سڵ نەکەم سوور بم لەسەر ئاوازەکەم
ژینم بێ قورئانە ئاشتی خوازەکەم
تا سەرکەوتن ، یا سەرەنجام وەکو ئەو
گیان ئەبەخشم هێندەشە ئەندازەکەم
وا ئەمناسن دوژمنم بۆیە تۆقیوە لێم
بیلالیێکم تا لێم دەن ( احد احد ) ئەڵێم



کاتێ دوژمن ڕانەوەستێ بەرامبەر
هێزی چەکداری ئەتەنن دەوروبەر
دەنگی باوەڕ دێ پڕ بکا دەشت و دەر
بناسێنێ موسوڵمانی کوڵنەدەر
هاوار بکا چۆن لە مردن سڵ ئەکا
ئەو کەسەی بیری شەهیدی وا لەسەر
وا ئەمناسن دوژمنم بۆیە تۆقیوە لێم پەروەردەکەم
قورئانییە ئەستەمە لە شەڕ هەڵێم

---

(٢) خوا ئەفەرموێ ﴿ ولا تهنوا ولا تحزنوا وانتم الأعلون إن كنتم مؤمنين ﴾ آل عمران : ١٣٩
واتە : لاواز مەبن و خەم مەخۆن هەر ئێوەن سەرکەوتووترین بەو مەرجەی موسوڵمان بن .

# خوایە بڕژە [١]

١٩٨١/٢/١٥ .....

خـوایــە بـڕژە لێـزمە بـارانـی ڕەحمــەت
بــەســەر گیانی موحەممەد تــا قیامــەت
کـــەسـێکی وا خــوا ئــاوا ڕیـــزی لێ نێ
بــە ( یــا أیهــا النبــي ) بیــدوێنـــێ [٢]
کـەسێ بــێ پـەروەردەی دەستی خـوابێ [٣]
موعجیـزەیــەو دەبــێ ڕەوشـتــی وابــێ
قورئانێکی زیندووە بـە هـەڵس و کەوت [٤]
وێڵ و گومڕا بوو ، ئەوەی شوێنی نەکەوت
گــەر مــانگێك پێك بهێنین بـە هەموومان
کــەم و کورتــین هەردەبێ لەو بێ ڕوومان

---

[١] ئاوازی بۆ دانراوە .

[٢] خوای گەورە ئەگەر پێغەمبـەرانی بـانگ کردبێـت ، هـەر بـە نـاوی خۆیانـەوە بـانگی کردوون وەك ( یا ادم ، یا نوح ، یا ابراهیم ، یا یحیی .. هتد ) بەڵام بۆ پێغەمبـەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ ئەفەرموێ : « یا ایها النبي ، یا ایها الرسول »

[٣] خۆی ئەفەرموێ : ( ادبني ربي فاحسن تاديبي ) .

[٤] خاتوو عائشە خانی خێزانی ئەفەرموێ : ( كان خلقه القران ) ، واتـە خووڕەوشـتی قورئانی بوو .

مـانگی روو زەرد هەر چەند بێ و باداتەوە
تیشکی خـۆرە وەردەگـرێ و دەیداتـەوە[٥]

وون دەبێ زوو تـیشکـی خـۆری لێ بـڕێ
با لـە خولگەی ژین بێ (دابین)یش گـەڕێ

ئەوەی تەنها دێو دەگرێ ڕێی جۆربەجۆر
نـازانـێ مـانگی نـزم ناگـا بـە خـۆر

خـۆری ( طـه ) گـەرمـە تینـی بـاوەڕی[٦]
بـەردەوامـەو دەبـەخشێ تـیشکـی زەڕی

ئـەوی بـەد گـۆیی بـەرامبـەر دەربـڕی
دڵنیـا بـێ سـەگێکـە و بە خۆر وەڕی



[٥] بێ گومان لە ڕووی فیزیکی‌یەوە مانگ تیشکی خۆر وەرنەگرێ نەیداتەوە
[٦] طه ـ نازناوی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیه وسلم ـ

# راپەڕین *

سلێمانی ١٨/٥/١٩٨٤

ئەی موسوڵمانی کورد ڕاپەڕینێ
بۆ بەرزی دینەکەت ڕەنجێ تینێ
ئەو کەسەی بۆ مەبەست خوێن ئەڕێژێ
ئەستەمە ژینی کۆیلە ببینێ



ئەی خوا ویستانی کورد هەستێ
بەسیە تاکەی وەها ژین پەرستێ
کوا غیرەتتان بەرامبەر بە ئیسلام
کوا غیرەتتان ئەگەر خاوەن هەستێ
کاتێ قورئانتان ئەسوتێ ، نرخی نابێ
سەد جۆگەی فرمێسکی خوێنین هەڵ ببەستێ



ئەم ئیسلامە لە هەر شوێنە
دەنگی ئازادییە و خەو زڕێنە
با هەموو لێک بڵێین بە موحەممەد
ئەی پێغەمبەری خوا دەستت بێنە
پەیمانی مردنت لەگەڵدا ببەستین
لە سەر کام ڕێگای دژوار و پڕ لە خوێنە

---

* کراوە بە سروود

# پەیمانی کوڕی شەهید *

سەردەشت ١٢ ١٩٨٨

زمان حاڵی ئەو منداڵە نازدارە باوک کوژراوەیە ، کە بێ هودە چاوەڕێی گەڕانەوەی باوکی دڵسۆزی کوژراوێتی !!..

بابە گیان هێشتا لەسەر ڕێت
چاوەڕێم چاوم کەوێ پێت
گەرچی دەشزانم بێ سودە
بەڵام سوکنایی دڵم دێت

بابە گیان دڵنیا بە لێم ئیسلامە ڕێم ، بەڵێنم بێ پێت
سوورم لەسەر ڕێباز و بێ باکم لەوەی مردن ڕێ بێت

هەر دەڕۆم و دەڵێم دایە
تاکو کەی باوکم هەر نایە
بەڵام ئەویش هەر وەکو من
تاساوەو چی لەدەست نایە

ئەویش هەر وەك من بێ هیواو بێ ئومێد هەر چاوەڕێیە
ئەویش هەر وەك من بە عەزرەتو چاوەڕێی هاتنەوەی تۆیە

بابە گیان هەر وا دێم لە دووت
تا بۆ دوا جار ببینم رووت
کوا زەردەخەنەی پڕ سۆزت
کوا هەست و هۆشی دڵسۆزت

---

* کراوە بە سروود

بابە گیان کوا کێ هەیە وەکو تۆ بێ دڵسۆزی من بێ
پاش تۆ کێ وەکو تۆ پشتو پەناو تیرەو هۆزی من بێ

منی موسوڵمانی هەتیو
منی کوردی خۆشی نەدیو
کێ بێ دەست بێنێ بەسەرما
ئاهێ بێتەوە بە بەرما

بابە گیان کوا کێ هەیە وەکو تۆ بێ دڵسۆزی من بێ
پاش تۆ کێ وەکو تۆ پشتو پەناو تیرەو هۆزی من بێ

بیرم دێ پێش ئەوەی بڕۆی
وتت کوڕم هیوای من تۆی
خۆزگە ئێستاکە دەتبینیم
کە چەندە عەشقی خوا و دینیم

خۆزگە دەتبینیم ئێستا قورئان و چەك وا لە دەستا
وەکو تۆش هەر دەڵێم خوێن دەبێ بڕژێ بەسەر مەبەستا

نازانم تاکەی هەر وا بم
تاکەی هەر وا بێ هیوا بم
خۆزگە من پێش تۆ دەمردم
نەك تووشی ڕۆژی ئاوا بم

بابە گیان کوا کێ هەیە وەکو تۆ بێ دڵسۆزی من بێ
پاش تۆ کێ وەکو تۆ پشتو پەناو تیرەو هۆزی من بێ

دەڕۆم و چەك بە دەست دێنم
تۆڵەی باوکی خۆم دەستێنم
تۆڵەی دین و تۆڵەی ئابڕوو
تۆڵەی شارو لادێ هەموو

خەڵکینە دڵنیا بن لێم ئیسلامە ڕێم ئەمەش بەڵێنە
دەشزانم ڕێبازی دین لاشەی گەنج و لافاوی خوێنە

# براکەم *

دیانە/ هەولێر ١٩٩١/٩/٢٥

براکەم ئەگەرچی وا زیندانە جێت
ئەگەرچی وەها کۆت و زنجیرە پێت
کە تۆ دڵنیای خوایە پشت و پەنات
وەهاش دڵنیا بە بەزین دوورە لێت



براکەم دەبینی ئەوەی ماندووە
لە رێدا کەساس و کڵۆڵ کەوتووە
دەسا دڵنیا بە ئەوەی بێ چەکە
هەتا نەیبێ بوونی نییە و مردووە



براکەم هەتا کەی دووریت لە خەبات
هەتا کەی سڵ و سرک و رارایە رات
کە ئاوا دەبینی هاودینانی خۆت
گشت موستەزعەف و ناڵەیان دێتە لات

---

* ئاوازی سروودی بۆ دانراوە

# شۆڕشی هەڵەبجە *

نەرویج ١٩٩٢/٣/١٨

هۆ هەڵەبجەی ئازیز وەك چۆن بووی هەر هەی
بـــە کوێـــــری چـــاوی دوژمنـــــانت دەی
شۆڕشـــێ بـــەرپا کـــە لـــە تۆڵـــەی خۆتـــا
تـــا دوژمنـــــت مابـــێ بمێنـــێ کڵپـــەی



شۆڕشـــێکی دی دەی بـــە ڕێبـــازی دیـــن
گشـــت ئاحـــەزانت پـــێی بێتـــە لـــەرزین
بســـەلمێنە تـــاکو یـــەك کـــوردێ مابـــێ
ســووره لەســـەر مـــاف و دووره لـــە بـــەزین



شۆڕشـــێ وا بـــێ وا پـــەره بســـتێنێ
بـۆ دوژمنـت بـێ چـەند و چـوون بسـەلمێنێ
خـــەباتی پـــیرۆزی کـــورد بەردەوامـــە
تا گشت مـافی ڕەوای خـۆی بەدەسـت دێنـێ



---

* سرووده و ئاوازی بۆ دانراوه

لــه تۆڵــەی تــۆ هــەزار هــەزاری وەك مــن
دژ بــە ناحــەزانت بــێ سـلْ لــە مــردن
لــە نــاو جەرگــەی مــەرگا وا راوەســتاوین
دۆستت پێی دڵخۆش بێ و شەقیش با دوژمـن



جــەللادانی خوێـن رێـژ لــە هــەموو لاوە
گــرێ قینــی خۆیــان لــە کــورد بــەرداوە
ســاڵەهای ســاڵە هێرشــی بــۆ دێنــن
کوردیش وەك پێشمەرگەی هەر زاڵە و ماوە



# شەوی کورد *

نەرویج / ۱۹۹۲

لە لای هەر گەل لە هەر جێ لە هەر لایە
سپێدەی نوێیە شەو روو لە کۆتایە
لە هەر کام گەل دەڵێی ، رۆژی لێ هەڵدێ
شەوی کوردە گزنگێ لە دووی نایە



گەلی کوردم بەهاری هەر خەزانە
شەوو رۆژی خەم وناسۆر و ژانە
گەلانی سەر زەمین گەیینە ئازادی
تەنها کوردە بەشی وا لێقەومانە



گەلی برسی . گەلی ئاوارە زۆرە
گەلی کۆیلە و ستەمدیوو جۆر بە جۆرە
بەڵام نەبووە گەلێ هەر هەمووی دیبێ
وەك ئەم کوردە کە ژینی هەر ناسۆرە



---

* سروودە و ئاوازی هەیە

دەرو دەشتی کوردستان چەندە جوان بوو
تاڤگە و ڕێژگەی هەوارگەوجێی سەیران بوو
بەڵام داخم نەما ئاساری جوانی
نەما شار و نەما لادێ وێران بوو



گەلی کوردم ، لە کوردستان بترازێ
نییە دۆستێ بدرکێنی لای رازێ
کەوا بوو با هەموو دڵسۆزی یەك بین
بۆ یەکتر با بکەین گشت راز و نازێ



گەلی کوردم ، ئەوی شمشێری دانێ
خەباتی خوێنی دلێری وەلا نێ
ژیان و مردنی بێ نرخ و ناوە
زەلیل و بێ بەشە ، با واش نەزانێ



# کۆچی ئاوارەیی *

نەرویج ١٩٩٢/٤

تاکو کەی ژانی گەل چەوساوەم
کۆڵی ئاوارە و کۆچی نەبڕاوەم
ساڵەهای ساڵە لەمدیوو بۆ ئەو دیوو
سەر لێ شیواوی ناو ئەم گێژاوەم



کۆڵی ناچاری ناسۆر و ژانم
نایەوە سەر شان .. بۆ کوێ ؟ نازانم
ساڵەهای ساڵە لەمدیوو بۆ ئەو دیوو
هاوار ولاتان منیش ئینسانم



لە شاری خۆما بێ جێگە و بێ ڕێم
روو لە کوێ کەم من ؟ هاوار بکەم کێم ؟
ساڵەهای ساڵە لەمدیوو بۆ ئەو دیوو
بەرەو رووی پشکۆ لە ئاگر هەڵدێم



نابینم گەلێ وەکو کورد وا بێ
جارێ بە زمانی خۆی رێ نەدرا بێ
لە ولاتی خۆیا و بۆ کارەساتی
شیوەن دەگێڕێ و پێی دەڵێن نابێ

---

* ئاوازی سروودی بۆ دانراوە

# پەیمـــان

نەرویج ١٩٩٢

قەســـەم بـــەخوا لـــە ڕێی دینـــی
ئەگـــــەر طـــــاغوتێکم بینـــــی
ئیمانـــــەی دینـــــی پـــــاکم کـــــا
بـــــەخوێنی تـــــاڵ ئەکـــــەم ژینـــــی



ئـــەڵێن دوژمـــن لەســـــەر ڕێیـــە
هـــەزاران جـــۆر چـــەکی پێیـــە
کـــەمن وێڵـــی شـــەهیدیم خـــۆم
بـــێ بـــاکم چۆنـــە لـــە کوێیـــە



ئەگـــەر پێـــم دیلـــی پێوەنـــدە
ئەگـــەر ڕێـــم پـــڕ کۆســـپ و کـــەندە
جیهـــاد خولیامـــە .. لەیلامـــە ..
چـــون ئیســـلامی پێـــوە بـــەندە



وەرن هـــــۆ ئــــــەهلی بێــــــداری
بائامانجـــــی بکــــــەین دیــــــاری
کــــــە حوکمــــی دادی خواویســــتی
بــــۆ گــــەل بێنــــین وەکــــو دیــــاری



وەرن پــــەیمانی بــــۆ خــــوا دەیــــن
هــــەمووماں تــــا لــــە ژینــــدا هــــەین
گیــــانو مــــاڵ و هەســــت و نەســــتمان
بــــە قوربــــانی ئــــەم دینــــە کــــەین



## مەشخەڵ

لەگەڵ زیــاد بوونــی سێدارە وکـۆت و زنجـیرو بەربەسـتا
لەگـەڵ ئـامی خرۆشـاوی رەش و رووتــانی ژێــر دەسـتا
هـەر دەبێ بازووی خوێنـاوی مەشـخەڵی قورئان هـەڵگرێ
چونکە بەردەوام پێویستە خوێن برژێ بەسـەر مەبەسـتا



# عومری لە دەست چوو

١٢ / ربيع الاول /١٤٠١
١٩٨١/١/١٨

ئێوارەی ژین بەسەردا هات ناچاری بازاڕ هەڵ بگری
بەرەو ماڵی گۆڕی تارت بە تەنها ملی ڕێ بگری
گوناهت کرد ، تامی ڕۆیی ، سزاکەی وا چاوەڕێتە
دە فرمێسکی پەشیمانی هەڵوەرێنە هەتا ئەمری
سەرەنگوێلکی گوناهکاریت وەك ڕندوو هەرەسی هێنا
مەگەر تۆبە بەری بگرێ ئەگینا ڕووزەردی ڕۆژی حەشری
تەمەن ڕۆیی ، حەشر دێ ، شادە سەرکەوتوو دەڵێ (هاؤم)[1]
چونکە لە خوانی قورئانی بۆ تێشووی پڕی کرد دەفری
دڵۆپە خوێنی شەهیدێ خاوەنی ڕووسوور ئەکا
لە مەحشەردا بریسکەی دێ کارنامەی سپی وەك بەفری
گەر کارنامەی تۆش براکەم پلەی شەهیدی تیا نەبوو
بەسەر عومری لە دەست چووتا لە (بەرزەخ) تاحەشر بگری[2]

---

[1] خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ فاما من اوتي كتابة بيمينه فيقول هاؤم اقروا كتابيه انى ظننت انى ملاق حسابيه . فهو في عيشة راضية . في جنة عالية ﴾ الحاقة / ١٩-٢٤

[2] بەرزەخ : قۆناغی ژیانی ڕۆح لە نێوان مردن و گۆڕ تا زیندوو بوونەوەی حەشر .

# مردن

١٩٨٠/٦/١٨ ....

شەرابە ئاکامی مردن پێی ئەگەی نۆشی ئەکەی
خاك بەسەر خۆڵت بە دامان بۆ فەرامۆشی ئەکەی
مردنە ساتێ لە پڕ دێ گۆڕی تەنگ و تارە جێت
فیطرەیە باوەڕ روناکە خۆت بۆ خامۆشی ئەکەی
کردەوەی بەد ئاگری دۆزەخ بە تینتر پێ دەکا
جا کەوا بوو بۆ بەدەستی خۆت بۆ خۆت خۆشی ئەکەی
بەرگی ڕێزە جێ نشینی کردگار لەسەر زەوی
تۆ بەرگی شادیت بێ بۆ سیا پۆشی ئەکەی
ژیرییە بەردی بناغەی بیر و هۆشی ئایینی
تۆ کە ئەو ژیرییەت بێ گەوجی سەرخۆشی ئەکەی
دڵنیا بن دێت و دەڕوا ، گەپلەیە ژین ، سیبەرە
نەفامی ، بێ باکی لێی ، خۆتی بێ هۆشی ئەکەی
من ئەڵێم و ئەرکی سەر شانم بەمەش سوکتر ئەکەم
گەرچی هێندێ کەس ئەڵێن تۆ بەران دۆشی ئەکەی



لەگەڵ وەرگێڕانی هەندێک کتێبی عەرەبی بۆ کوردی ، هەندێک دێڕە شیعریان تێدا بوو درانە من تا هەر بە شیعر تەرجومەیان بکەم :

ئـــەوەی چـــاوی دڵــــی عاشـــق دەیبینـــێ
ئەسـتەمە دوو چـاوی سـەر دەرکـی پـێ کـا
بـــانی عاشـــق بـــەرەو عەرشـــی خوایـــی
بـــێ پەریشـــەو تـــاوێ دەتوانـــێ ڕێکـــا



چـــاوە بگـــری کـــە ئـــەمڕۆ بـــۆ زوڵـــم و زۆر
هـــەزار پـــەڵپ و بیـــانووی بـــۆ دەدۆزن
بەراســـتی زۆر لـــە خـــەڵکی ئـــەم زەمانـــە
تـــەواو بـــوون بـــە وشـــتر و گـــورگ و بـــزن



دەبـــێ بمـــرێ ئـــەوەی وا لـــە ژیانـــا
تەنـــها خوایـــە هـــێزی ئـــەمر و زانـــا
ســـــتەمکاریش ڕۆژێ دێ بتلێتـــــــەوە
ئـــەمرو ئـــەژی لـــە نێـــو ئـــازار و ژانـــا



## بۆ شەوی قەدر

دڵــی زینــدوی تامــەزرۆی ژوانــی خوایــی
چــاوەڕوانی شــەوێکە ڕۆحــە بــایی
شــەوی قــەدری قورئــان و بــەزەیی و فــەڕ
لــە شــانازی ئــەوا شــەو دێتــە شــایی



ئــەوی بــاجی سەربەســتی خــۆی نــەدابێ
دەبــێ پشــتی بــۆ بــاجی مــانی دابــێ



گــەر ئامــادەن لــە ڕێگــەی خــوادا گلێــن
چــۆن و بۆچــی و لــە کــوێ دەبــێ هــەر مــەڵێن



هەر کەست دی بە هەر شێوە دوژمنی تۆی خۆش بوێ
چاوەڕێ بە دوژمنێتی بەرانبەر تۆش دەرکەوێ



# بۆ میستەر هودلی

١٩٨٠/٦/٢٥ .....

لۆرد هودلی ئەو زانا ئینگلیزییە بوو کە لە ساڵی ١٩٣٨ دا ئیسلامی بردە بەریتانیاوە . موسوڵمانێکی میسری لە پارچە شیعرێکیدا باسی کردووە . ئەمەش وەرگێڕانی دوو دێڕە لە شیعرە عەرەبییەکە ، کە لە نامیلکەی ( حرکه الإسلام و مفکروا الغرب / د. محسن عبدالحمید ) دا هاتووە . نامیلکەکە کراوە بە کوردی بۆیە ئەم دوو دێڕەش بە شیعر وەرگێڕراوە .

ئەوەی خەڵکی بەرێز بۆی راوەستن وا بەرێزانە
ئەڵێن ناوی لە ریزی دین پەروەر و خێر خوازانە
پێوەری خەڵکی وەها بێت هودلی خۆی لێ بێ خەم کە
کە گومانی تیا نییە نێوت لەگەڵ سەرفرازانە
رێبازی راستیت زوو ناسی ، وەك ژیری شوێنی کەوتی
چاکە خوازانە ژیایت و رێنماش کاری کارزانە



لە هەر چۆڵ و چیاو هەردە لە هەر بن دار و بن بەردە
لە هەرجێ شارە یا گوندە هەمووی هەر سەنگەری کوردە
وەکو مژدەش لە هەر جێیە دەبینی خواوویستی لێیە



# شۆڕشی کورد

١٩٨٠/٦/٢٤ ....

کورد ئەڵێ راستە چاوەڕێم کەسێ شۆڕشم هەڵسێنێ
دەنگ و سۆزم بەرز تر کا نەهێڵێ کەس بم چەوسێنێ
بەس دەبێ زوو ئاشکرا کا پێڕەوی رێبازەکەی
پێش ئەوەی شەیپوری شەڕ لێدا خۆییم پێ بناسێنێ
مارانگازم سڵ ئەکەم لەو رێیەی ئیسلامی نییە
چونکە رێبازی تر کوفرە ئاواتییە من بتاسێنێ
گەندەڵێکی مایە پوچە لیبراڵی سەرمایە دار
سەرەنجامی خۆڵە مێشە چەند گڕی کڵپە بسێنێ
لە گوێشمدا زرینگەی دێ دەنگی بوخارا ئەڵێ[1]
کینەی رەشی مارکسیزم شیرازەی ئیسلام ئەپسێنێ
(ئۆزبەگستان)ی برام دوێ رووبەرووی ستالین وتی[2]
سەرکردەی پۆلایین ، راستە دەستت مزگەوت ئەڕوخێنێ
راست ئەکەی توانی بەجارێ قورئانەکان لەسەر سینەم
کۆ وەکات و بە پزیسکێ هەموویان لێک بسوتێنێ

---

[1] بوخارا : گەورەترین ویلایەتی ئیسلامی بوو (٣٠٩) پەیمانگای ئیسلامی تێدا بوو کە هەر هەمووی لە ساڵانی ١٩٣٦ ـ ١٩٤١ لە لایەن کۆمۆنیستەکانی رووسەوە روخێنران

[2] ئۆزبەگستان : وڵاتێکی تری ئیسلامی بوو ئەویش وەك بوخارای بەسەر هات .

بەلام خۆ هەر دەسەوسان بوو تا مردیت ساتێ نەیتوانی
بە هەموو هێزی سەربازی باوەڕی من بهەژێنێ
باوەڕی جێگیری ئێمە کلپەی گڕێکی خواییە
ناوێرێ (دەستی پۆلایین) خۆی بەرامبەر بوەستێنێ[٣]
داری ئایین ڕەگی ڕۆچوو بە ناخی دلا چۆتە خوار
ریشی مارکس چۆن ئەتوانێ ڕەگی ئەو دارە دەربێنێ
خوێنی ئالی بیست و شەش موسولمان خستیە روو
ئەستەمە (ثەورەی ثەقافی) ئیسلامەتی بفەوتێنێ[٤]
بۆیە منیش سڵ ئەکەم لەو ڕێیەی ئیسلامی نییە
چونکە ڕێبازی تر کوفرە و هەر ئەو ئەنجامەش دەهێنێ
من (سوعەید)ێکی نەورەسیم ، قورئانەکەم گرتۆتە دڵ[٥]
سەرکردەی بت ، شۆڕشی سوور ناتوانێ لێمی بسێنێ



[٣] دەستی پۆلایین : نازناوی ستالینە

[٤] ثەورەی ثەقافی: شۆڕشی رۆشنبیری : انقلاب فرهنگی : کە هەر خوێن ڕشتن بوو .

[٥] سوعەید : ناوی بچوك کراوەی سەعیدە و مەبەست لەوەیە کە شاعیر لە ڕاوەستانیدا دژی کوفر و تاوانکاری خۆی بە سەعید نەورەسی‌یەکی بچکۆلە دادەنێت . سەعید نەورەسی موسوڵمانێکی بلیمەت و لێ هاتووی کوردستانی تورکیا بوو . دامەزرێنەری کۆمەڵەی (نوور) بوو لە تورکیا .

# نامەیەك لە شەوی لە سێدارە دانا

١٩٨٠.٨.٢٧

مامۆستای لاوی خوالێخۆش بوو شەهید ( هاشم الرفاعی ) لە شەوێکدا نامەیەکی لەسەر زمانی یەکێک لە برا موسولمانەکانی بۆ باوکی رازاندەوە ، تا دیمەنی هەست و هۆشی شۆرشگێرانەی لاوێکی موسولمان بخاتە روو تا وێنەی زیندووی بزوتنەوەی ئەو ویژدانە بنەخشێنێ کە لەگەڵ رووداوەکانی ئەم میللەتە ئیسلامی‌یە لە خرۆشایە .. تا وێنەی شۆرشێک پیشان بدات کە دژی ئەو زۆردارانەیە کە حوکمیان لەسەر ستەم و نارەوایی دامەزراوە .. ئەو شەوەش وا دیارە کۆتا شەوی ژیانی ئەو برایە بێت چونکە بۆ سبەی ئەو گەردنەی سەری بەرزی موسولمانێتی ئەوی هەڵگرتبوو : پەتی سێدارەی تێ ئاڵێنرا و شەهید کرا .

بابە گیان چیت بۆ بنووسم کە من هەر ئەمشەوم ماوە

کەوا وەردیان و سێدارە چاوەڕێمن لە ئێستاوە

منی بەندی گۆشە گیر چیت بۆ بنووسێ خامەکەم

کە دەستم زنجیرە بەند و کۆتم لە گەردن ئالاوە

قۆناغی ژینی دونیاییم ئەم شەو کۆتایی پێ دێنێ

بۆیە هەموو تاریکی ژین ئاوا گەمارۆمی داوە

بێ گومانم ئەمشەویش وەك شەوانی دی رادەبوورێ

سبەی لاشەکەم دەبینن وا بەسەر شانتدا داوە

هــەر چۆنێ بــم ئـەنووسم بۆت تا بۆ دوژمنان بســەلمێ
باوەڕی دینـــی نــاژاکێ ئەگــەرچی لاشـــە جنــراوە



گەرچی ماتی کوشندەی شەو تارمایی خنکاو دەرئەخـا
یــادی ڕۆژانــەی پێشینــەم لــە دڵـدا سەریان هەڵداوە
لــە تــاو ژواری بــریـنی برینــی گـۆشت و ئێسقــانم
پەنــامە خەیــاڵی نووری ئەو قورئــانەی کە سوتاوە
دەرونم مــل کــەچە بۆی و هــەر ئــایەتێ خوێندبێتم
موچڕکی تـرس و لــەرزی خوای بە گشت گیانما هێناوە
ژیــام بــاوەڕم بە خــوا بوو بەڵام تــا ئێستا نەمزانی
ئەو بــاوەڕە چ تــامێکی لـــە نــاو خۆدا حەشار داوە
دەبــا لای بــەن کــە من تێرم زۆر سوپاسیشیان ئەکەم
نــامەوێ قــەت خواردنی وان گۆشتی خۆمی تێکەڵاوە
خۆراکی وا تفت و تاڵم لــەســەر خوانی خۆم نەدی قەت
کـەی ئەمە خواردنی مرۆڤە ؟ کەی ئەمە مرۆڤ لێی ناوە؟
دەستێکم بۆ ڕابهێڵن سوور بــوو بێ بـــە خوێنی خــۆم
خۆم ئــەوەم پێ خۆشە چونکـە خۆم بۆ شەهیدی داناوە



بە هەر چــوار دەوری دیواری ڕەش و ڕەقا نی‌یە ڕوونی
مــەگــەر لــەو پەنجەرۆکەی وا بە شیشی ئێنجی تەنراوە
پــەنجەرەی چی؟ ئــەویش بەندە وەکو دەنگی منی بەندە
ئەویش هەتــا سینــەی بــەردە و لە چیمەنتۆ چەقێنراوە

نـــه پڕ سینەی هـەوا ئەمژێ ، نە ئاهی دەردەچێ جارێ

مـەگەر جارجارە ڕێی من دا . ئەویش هێندەی ڕێ دراوە

گەلێکم چـاو بـە چاویـا گـرت هەتـا لێیەوە بـــڕوانم

وەك بێداری ســەرنج دەمــە ئـــەو میللەتە ماف خوراوە

دەبینم روو ، دەبینـــم دڵ ، هەست وهۆشی هەقپەرستان

چۆن دەکوڵێن، چۆن دەخرۆشێ ، گەرچی بە تەم داپۆشراوە



کـــش و مـــاتی شەو لـــەپڕدا زڕەی زنجـــیرە ئـــەیبڕێ

پـــاسەوان لـکی شۆڕ بۆوەی بۆ لای سەر شانی هەڵداوە

هەر ســـاتـــە نـاساتێ بە زۆر خەو لە چاوی ئەتۆرێنێ

وەك عـــەودالێ چـــاو ئـــەگێڕێ لــــە هـــەلاَتنم ترساوە

بەلاَم لــــە درزی دەرگـــاوە کـــە سەیری ژوورەکەم ئەکا

دڵی هێمـــن ئـــەبێ چونکـــە بنـــی پێی نێچیر ئـاوساوە

هـــەســـت بە ڕق و کینـــە ناکەم بەرامبەری بە هیچ شێوە

چی کـــردووە تـــاکو وا بم ؟ ئەویش بـــە ستـــەم تاساوە

بـابە گیـــان ئەویش وەکـــو تۆ دڵ و ڕەوشتی زۆر پاکن

بـــەلاَم ئەمڕۆ پـــاروە نـــانی ئەو وا بە دڕکـا گیرساوە

خۆ ئەگەر وەنەوزێ جـــارێك چـــاوی لێم پێ بکـا غافڵ

خێزانـــی تـــاڵی ئـــەچێژێ ، خۆشـــی زیندووی نەبڕاوە

کـــێ ئـــەزانێ ؟ لـــەوانـــەیـــە بـــگەڕابـایـــەوە ماڵێ

شێوەمی بهاتبا یـادو بگریابا وەك وەی کوڕی خۆی خنکاوە

گەرچی بەندیخانەکەیشی درندەیە تۆقێنەرە
لەوانەیە شاعیر بوایە ئەمەی بە شیعر بهۆنراوە



خۆ زیانم لێ نەدەکەوت . تووشی ئەشکەنجەش نەدەبووم
رازیش دەبووم بەو قسانەی گوێی هەندێك پێی ئاخنراوە
وەکو هەموو دڵ بەزیوێ خۆ دەمتوانی مت و کپ بم
بێ باس و خواس ، وەك ئەو بەردەی لە بن گۆما دارزاوە
هەمان هەست و سۆزە لای هەموان ئەگەرچی کەس نی‌یە
ئاشکرای کا ، چونکە خەڵکی لە بێ دەستی حەپەساوە
هەست مردووە ، ترسنۆکە ، نەفامێکی هیچ نەزانە
ئەوەی وا بە کۆدەتای گەمژەو گەوێلان خەڵەتاوە
ئەو ئاگرەی وا لە دەوری گەل کلپەی بڵێسە ئەدا
ئەو خوێنە دای ئەمرکێنێ کە لافاوی پێ هەستاوە
دڵم وریایە بابە گیان ، وەك خۆی ئاسایی لێ ئەدا
گەرچی سبەینێش ئەیبینی وا لە لێدانی وەستاوە
ستەم ماوە ، وا زوو کۆتی ئاپسێ بە مردنی
گۆرینی هێزێکی ئەوێ ، هێزیش شۆرشی خوێناوە
با ستەمکاران هەزاری وەك من و تۆش لە دارێ دەن
گەل زانە . چۆن زەرەر دێنێ . کە تاکێ بەرخی خوراوە



هــەســت و سۆزی دەرونە وەك زیندویەك ئاوەها ئەدوێ

تـــا بۆ جیهـــان بســـەلمێنێ کە قەت وەك کۆیلە نەژیاوە

بـــاوەرە پێم ئـــەڵێ ژیـــــان گـــەلێ مـــــەزنترە لـــەوەی

چـــەپڵە لێدەی بێ مافی بوون بۆ وەی بە حوکما هەڵزناوە

ئەڵێ گـــەرچی سبەی کۆتا هەناسەت دەر ئەچێ لە گیان

لـــە پـــاش خـــۆت بۆیـــان دەبیتە ئێش و ئازاری نەبڕاوە

زەنگوڵـــەی خوێنی تکـــاوو پێستـــی شـــین و مـــۆری تۆ

ئۆفـــی ژانـــی ســـەرو سینەت کـــە ئاوا خوێنی تێ زاوە

سپێدەی رۆژێکی نـوێن و نـــووری گزنـــگی ئـــازادیـــن

ستەمکـــاران دڵنیـــان دێ ، بۆیـــە هەمـــوو شڵــــەژاوە

فرمێسکی سەد بەندی وەك تۆ کە دەتکێ بەسەر پێوەندا

لەگەڵ خوێنی شەهید سبەی دەستیان لە دەستی یەك ناوە

بـــە هـــەر دوولا لێرەو لـــەوێ کـــە جۆگە زۆر هەڵدەبەستێ

دەبنـــە لافـــاو ، رادەمـــاڵن ئـــــەو رژێمـــەی روێنـــراوە

خـــۆ گـــەلێ جـــار رەشەبـــا کاتێ هەڵ دەکا ، ئاو هێمنە

کـــەشتـــی لـــە رۆخی دەریـــادا دابێن بووە و دامەزراوە

گڕی ( ئاگر پڕژێن )یش تـــــا زۆر تر لــــە ناخا کڵپەی بێ

هێز زیاد دەکـــــا ، هێرشی دێ بـــە بەرد بە ئاسنی تواوە

دڵۆپە دڵۆپی بارانیش کــــە یـــەك بـــە دووی یەکدا هاتن

روبـــــارێ وا پێك دەهێنن کـــــە لافـــاوی وا بە دواوە

بە یەك دەست هەڵدەکێشن زوو رەگ و ریشاڵی زۆرداری

جـــا ئـــەو سبـــاتە ئۆف و نـــاڵە و هاواریشیان سەر بڕاوە



نازانم ئاخۆ لـــــه پـــــاش مـــەرگم بـەسـەر هاتم دەبێ
وەك رووداوێ بوتـــــرێ ؟ یـــا دەچێتـــه گێژی هەواوە
ئـــاخۆ بـــاسم لـــــه نێو دێڕی پـەڕەی مێژودا چ بێ ؟
کرێ گرتــــــەم ؟ یـــا وام لـــەگەڵ شکێنەری بتی پواوە
خـۆ ئـــەوەنـــدەی خۆم بـــزانـــم دڵنیـــام توانام نی‌یە
گوێچکەی مل کەچی تەپ کەم، وەك ئەوەی دینی بەرداوە
خۆ ئەگەر لـەم شۆڕشـــەم دا هیـــوام مـــاڵێ نـەبووبێ
دەستـــی میللـەتی لێ گیر بێ ، بۆ خۆم لەم گێژاوە داوە ؟!
ژیـــــانی پـــڕ رێــــزم ئـــەوێ ، بێ کۆت و زنجیری پێ
بـێ تۆقـــاندن . وەك ئـەو ژینەی ئیسلام فەرمانی پێداوە
دەمـــــاری لـــەش جۆگە خوێنی ئـــــازادیخـــوازانـەیـە
گـــەر بشکلێم عیزەتی نەفسم هـــەڵ ئـەگـــرم کـــە رواوە



بـــابــه گیـــان سبـەینێ کاتێ سپێدە تیشکی رۆژ دێنێ
ئـــاشکـــرانە دەخـــاتە روو کـــردەوەی بـــەدی شاراوە
لـــەگەڵ ئـــەو دەنگە زوڵاڵەی هەتیـــوی سەموون فرۆشا
کــــە لێك دەدەن لـــەو دەرگـــایەی بـــەڕوویانـا داخراوە
لـــەو کـاتەی ئەو وەك عادەتی دێ لە دەرگای ماڵێ ئەدا
سبەینێ زوو وەردیـــانێك لـەبـەر دەرگای من وەستـاوە
فەرمووی سێدارەم لێ ئەکاو ، هەروا لەدوای ساتێکی کەم
لـــەگـــەڵ نـــان خـــواردنی ئێوە ملـــم بـــــە پەتدا کراوە
لە پێش تەواو بوونی ئێوە رۆحی من بە خوای خۆی ئەگا
ئیـتر هـــــەر لاشـــەی مردوومـــه کـــه به دارا هەڵواسراوە



بـابــه گيـــــان با ويْردی پرسەت تابلۆی ئاگاداری بیّ
كــه پــەتــی ئــەم سێــدارانـــه لـــەم ولاّتـه ئەرێسراوە
لــــه جێیەك رێســـراوە ئەڵێن ( خاوەن شارستانی)یە!!
یـــان ئــەڵێن گوایــه ئاوایــــه . ئـــاوا بۆ ئێرە هێنراوە
به يارمەتی ئاڵقه لـــه گوێ و بــەكرێ گیراوانـــی ناوخۆ
بۆ ئـــەم ولاّته زامــــــارەم بـــه تايبــــەتی نێــــرراوە
بــابــه گيـــان حەز ناكەم ئیتر شەوو رۆژت پشێوی بێ
خەفــەت گــرتوو ، كراس رەش ، وەكو له لای خەڵك باوە
ئـــا بــابه گيـــان چـاك بزانـــه كوڕی له سێدارە دراو
ئەوەنــده عــەشقی خـــوا بـوو بوو تا له ڕێیا سەری ناوە
تۆ بـیرت دێ كـــه منالّ بووم چەندت سرود فێر دەكردم
دەربارەی خۆشەويستی خواو خاك‌و ئەم خەڵكه چەوساوە



توخــوا بـــابه هـــەر كـاتێ دیـت دایكم فرمێسك ئەڕێژێ
بۆ ئـەو كـــوڕە شەهيـــدەی وا لـه تافی لاوی سەری ناوە
كـــه بينيـــت وا ئـــاهی ژان و پرمەی گريـــانی به كوڵی
لــەبـــــەر دراوسێ كــپ دەكاو ، ئەمەش ژانێكی دی داوە
توخوا بـــابــــه لـــەجیــاتی من داوای لێ بووردنی لێ كه
هەردووك ، گــەردنــــم ئـــازا كــەن لەو هەڵانەم كه ڕوویداوە
قسەی نـــەرم و نيـــانی ئەو ، وا له گوێمدا زرینگەی دێ
جـــارێ به سۆز ، جـــارێ گلەیی ، یـــا به تووڕەیی سزاوە

کو ی خۆم کـــوڕی شیرینـــم تـوخــوا بەسە توانام نەما

دڵم خۆش کەو سەرپێچی بەس . وەکو خۆت بەڵێنت داوە

بــا بـگــەڕێم کچێکی ژیـــری خـــۆت ئـاسا بهێنم بۆت

یـــا خـــۆت بیڵێ . ئەو ئـــاواتەم بهێنــە دی بێ ئـاژاوە

هیـــواو ئـــاواتی ئـەو وا بوو . بــەڵێ بەڵێنیشم دابــوو

بەڵام خەبـــاتی خواوویستی خۆشترە لــە ژیـــانی براوە

نـــازانــم ئـــاخۆ لـــە مـەو دوا هیواو ئاواتی چ دەبێ ؟

مـەگــەر هەر خوا ئارامی خۆی ببەخشێ پێ ی هەتا ماوە



بـابـــە گیـان ئەمە بوو وویستم وەکو ڕاسپاردە بینووسم

ئــەمــانــەشن لــە ناخمدا . لـــە فیکرمـدا . گیر دراوە

بەڵام بــابـــە ڕونـــاکی دێ . گەر خوا حەز بکا نەیبینی

هــەرچـــی یاسای کوفرە ئەوا لە ژێر پێ ی گەل شێلراوە

جـــا ئەوی هـــاو وڵاتیم بوو . جـارێ دێ بیمەوە یادی

خۆ ئـەگــەر یەکیـش نەناسێ . هەموو لای خوا ناسراوە

هیـــوام ئاسودەیی گــەلـــە . لـــە سـایـەی شەریعەتێکا

بـــە فەرمانی خوا دێتە دی و نەخشەی لای ئەو داڕێژراوە



# کێ .. کەی .. لە کوێ ..؟!

١٩٨١/٨/٢٢ .....

کێ کـەی لـە کـوێ بیستی ژیانی تاڵی کورد
کێ کەی لە کوێ فرمێسکی رشت بۆ حاڵی کورد
کێ کەی لـە کوێ دڵ و دەرونـی داخورپـا
بۆ نوورەی کـپ کـراوو نـاڵە ناڵی کورد
کێ کەی لە کوێ هەست و هۆشێکی هاتە بەر
بۆ لافـاوی خـوێنـی رژاوی ئـاڵی کورد
کێ کـەی لـە کوێ بـاوەشی سۆزی کردەوە
بۆ هـانـا و زریکـەو ژانـی منـاڵی کورد
کێ کەی لە کوێ ژێری جولا و سوودی هـەبێ
بۆ کوردستـانـی بێ نەخشە ی زوخاڵی کورد
کێ کەی لە کوێ (مەی) بـابە گوڕگوڕ بنۆشێ[1]
ئـەڵێ بـژی رەش و رووت و رەجـاڵی کورد
ئەوی بۆ پـارە سـەر یەك نـان بلێسێ پێ
بۆ خەریـك بـێ بـە ئـازادی مەحالی کورد ؟
مـادام ڤیتـۆ سنـووری ولات دادەنـێ[2]
هـەروا دەشێوێ مێژوی کـۆنە سـاڵی کورد

---

[1] مەی بابە گوڕگوڕ : مەبەست لە نەوتی شاری کەرکوکە

[2] ڤیتۆ حق النقض : مافی بەرهەڵست کردن ئەو مافەیە کە ئەمریکا و روسیا و چین فەرەنسا و بەریتانیا هەیانە لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ، کە دەتوانرێت سەدان کێشەی وەك کێشەی کوردی پێ بێ دەنگ بکرێت

رەوشتی پاکی ئەم ئیسلامەیە چارە

بۆ دڵسۆزو ئازادیخوا وعەودالی کورد

کاتێ دەڕوێ لەگەڵ خوێنا لە کوردستان

( الله اکبر ) بە دەنگی زوڵاڵی کورد

لە جێی گوڵبێنەی[٣] سەربازی ونی کوردا[٤]

سەری ڤیتۆ کڕنوش دەبەن بۆ زاڵی کورد



[٣] گوڵبینە : چەپکە گوڵ .

[٤] سەربازی وون : سەربازی نەناسراو : مەزاری ئەو سەربازە نەناسراوانەیە کە لە کاتی جەنگدا کوژراون و تەرمەکانیان دەست خاوەنیان نەکەوتوونەتەوە .

# بۆ دەرون بەزیوەکان

١٩٨٢/١٢/٣

لــە چەرخی پڕ لــە گێژاوی ستەمکاری و ڕق و کینە
لــەم شــەوی تــاری تــاوانەی گرتــوویە رووی ئەم زەمینە
لە ژێر سایەی ڕژێمی بەد دەنەخشێ مەرقەدی مردوو
کەچی دەجنرێ و بێ گۆڕیش دەبێ دڵسۆزی ئەم دینە
لە ژێر باڵی ڕەشی کوفرا کە دەکشێ بەسەر مزگەوتا
لــە گشــت ماڵێ دەبینــرێ پرســەیــە گریــانە شینە
دەشێ لە سووچی مزگەوتی ( ضرار )ا خۆت کڕو کپ کەیت[1]
مۆم و بــوغرد و داری عــــود بسوتێنــی بۆ ئەم ژینە
تۆ لە خۆشەویستی خوادا دووسێ فرمێسك دەڕێژی
بەڵام فرمێسك‌وخوێن هەردووك نرخی رووی خودا بینینە
تۆ (اياك نستعين)ت بۆ پلــە و پــــایــــەی دنیــــایــە
بەڵام ( اياك نعبد )ش بۆ بــەرگــــە کفنـــی خوێنینە
ریش و تەسبیـــح و نزای هەزارانــــی وەکـــو تۆیـە
بۆ بەردەوام بوونــی طاغووت تەلە ، دڕکە زی پەرژینە

---

[1] مزگەوتی ضرار : مزگــەوتێ بــوو کــە دووڕووەکــان لــە مەدینــە دروووســتیان کــرد بــۆ چاوبەست کردن لە موسوڵمانان . تا وای نیشان دەن کە زۆر خواپەرستن ! بەڵام خوای گەورە پیلانەکانیانی ئاشکرا کرد و پێغەمبەریش (صلى‌الله عليه وسلم) ڕوخاندی .

گوایه ئەمڕۆ کە نەما هیچ بستە خاکێکــی ئیسلامی
رێگەی رزگــاری و ئازادی هەوڵە یان دەروون بەزینە
ئانەمەی وا تۆش براکەم بە سەبری مەککەی تێ دەگەیت
دڵنیــا بــە خۆ کوشتنە چونکە تۆ (ذل ) ئەکەی پینە
سبەی یا دووی کاتێ سەربازانــی کوفر هێرش دێنن
دەبینی میحرابی روخاو وەك قورئان بە خوێن رەنگینە
قورئــانی پیرۆز و میحراب چۆن وایان لێ بەسەر نایە
کــە پاسەوانی هەردووکیان شاڵ و شمشێری دارینە
مــادام شەوورۆژی ژیــان بۆ هەردوولا وەکو یــەکــــن
هۆی جیــاوازیش تــەنهــا ( فضل الله المجاهدین )ە
دەســـا خوایە بە تەنهاش بم پەیمانم نوێ دەکەمەوە
تۆش شەهیدیم بە نسیب کە لەسەر ئەم دینە شیرینە



# تاك و بێ چەك

پاوە / ئێران - ١٩٨٤

هاندانێكی ئیسلامییەكان بوو بۆ هاتنە مەیدانی جیهاد و كۆتایی هێنان بە دوودڵی و رارایی .. لەم ساڵانەدا هاتنە مەیدانی جیهادی چەكداری یان نەهاتن و خۆ مت كردن بابەتی موناقەشەی هەموو كۆڕێكی ئیسلامی بوو !.

لە شارا بێ یا لە سەحرا و كێوی چۆڵ
تاكو ( تاك )ی دەبێ خەم بگریتە كۆڵ
ئەو كاتە رۆی كە لە جۆرەی خۆت دەبووی
رووت دەنایە شاخی عاسی و دەشت و دۆڵ
چونكە ئەمڕۆ ئەشكەوت و ڕێ یاساغن
بە ڕووی تۆدا ئەگەرچی كوردیو كڵۆڵ
چونكە ئەمڕۆ ڕۆژی حیزب حیزبێنە
موسوڵمانیش لاڕێ كەوتووە بێ ڕۆڵ
ئەوی ئەمڕۆ بێ چەك و پارت و كۆڕە
ئەوەك هەر جاشە .. كورد نییە و زۆڵ
تۆش كە هێشتا قۆناغی مەككە دەبڕی
با پیشەت بێ بە خوێن تەڕ كردن مژۆڵ

سەرەنجامی متی تۆ و بتی دوژمن

ئەم ئیسلامە کەوتووە وەك شێری کۆڵ

لە بن تۆزی سەفاراتی وڵاتان

لەبەر دەرگای هەڵدەتوتن کورد کزۆڵ

لە بن تۆزی پێشمەرگە بۆتە جەردە

لە بن تۆزی مۆنج ئەدا بیری کرمۆڵ

ئاخ بۆ ئەو رۆژەی موسوڵمانانی کورد

دێنە مەیدان وەکو ئەفغان توند و تۆڵ

خۆزگە دەمام و دەمدی چەکی دەستیان

تەنگ هەڵدەچنن بە بیری پەرپدەو زۆڵ

جا شەرعی خوای وەك یاسا دێنایە پێش

جاهیلیتیشی دەرمان دەیکردە خۆڵ



# سروودی سەربازگە

١٩٩١/٥/٢١

سروودی دەست پێ کردنی مەشقی سبەینانی سەربازگەی صلاح الدین بوو کە پاشان بووە سروودی فێرگەی سەربازی و خولە سەربازییەکانی دوایی :

ڕێگەی جیهاد ئەگرین هەموو
هەرگیز لێی لانادەین بە موو



دژی کوفرین بە هۆش و هەست
دژین بە دڵ . بەدەم . بە دەست



خواویستی ڕێی ڕزگارییە
ئیسلام مایەی بەختیارییە



پەیمان ئەدەین مان و نەمان
تەرخان ئەکەین بۆ و دینەمان



ئەمەش هوتافەكانی كاتی مەشق كردن بوو :

ئێمە نەوەی صلاح الدینین قوربانی ڕێبازی دینین
ئێمە نەوەی صلاح الدینین تۆڵەی دینی خوا دەستێنین
تۆڵەی دین و تۆڵەی ئابروو تۆڵەی شار و لادێ هەموو
پەیمان بێ بۆ خوا تا مردن لە جیهاد دا بێ بێ سڵ كردن
ئێمە پێشمەرگەی ئیسلامین دوژمنی سەرسەختی صەددامین
تەنها پێشمەرگەی ئیسلام
ئاوها بە هەیبەت و سامە



تۆڵەی هەڵەبجە و خورماڵ
توند تر دەبێ ساڵ بە ساڵ
هەڵەدن و سەرگەڵوو
لە تۆڵەیان داین هەموو
تۆڵەی هەموو بادینان
دەستێنین لە بێ دینان
ڕاپەڕن ئەمڕۆ هەلە
ئیسلام ڕێبازی گەلە



# هێزێکی مۆمیا کراو

تاران ١٩٨٤

کام هێزەی زۆر تۆقێنەر بوو

لەسەر زەمین

یان وەك ئەتۆم ترسێنەر بوو

درابووشە

دەست خوێنرێژی وەك ستالین

بڕوات نەبوو لە شەصتەکان [1]

کاریگەر بێ

وەك یەك پیتی

وشەی ( اخوان المسلمین) !..

کەچی ئەمڕۆ

هوتافی ( الجهاد ) ەکەش

وا بۆتە ماددەی پێکەنین !..

چونکە (جیهاز)ە شێرەکەی ئیمام بەننا [2]

هەر لە پاش خۆی

مۆمیا کراو

دان و نینۆکی هەڵوەرین !..

---

[1] سالانی ١٩٦٠ ـ ١٩٧٠ ز

[2] ئیمام بەننای رەحمەتی دەزگایەکی بە ناوی ( الجهاز السری) . یان (النظام الخاص ) ەوە . درووست کردبوو کە مەشقێکی گرنگی سەربازیان پێ کرا بوو . بۆ تیرۆر کردنی ناوانباران خۆی بە جیهازی ( شێر )ی ناو دەبردن

# فرمێسك

تاران ٦/١٩٨٤

کاتێ قورئان ئەسوتێنن وەکو ( ئەتك ) ێ
لە تۆڵەیدا
ئەوی کە زۆر لەخواترسە
دوو دڵۆپ فرمێسکی ئەتکێ !..
بەڵام بە درێژی مێژوی دین
هەموو فرمێسکێکی خوێنێ
یا هەنیسك و لووشکە کردن
دەبوون بە ژان
دەبوون بە قین !..
ئەی ئەمڕۆ بۆ
لە ترسی ئازار و مردن
نابنە وورەی ئیسلامبولی[1]
نابنە گیانی تۆڵە سەندن !..

---

[1] خالد ئیسلامبولی : ئەو ئەفسەرە قارەمانەی کۆمەڵی جیهادی میسری بوو کە( انوەر سادات )ی سەر کۆماری میسری کوشت ..

# گیانی تۆڵە

سلێمانی ٢٠/٧ ١٩٨٤

| به بۆنەی شەهید بوونی مامۆستا مەلا عومەری تیمارەوەیە کە لە لایەن پێشمەرگەی ئازادیخوازی یەکێک لە لایەنە سیاسی‌یەکانی کوردستانەوە ترۆر کرا !.. |
|---|

چەندین ساڵە

بیری رزیووی ( لات ) دەجوون[1]

دەمە داسی شکاو دەسوون

دەتانەوێ

خوێنی داعی و مەلا و موفتی

لە چەکوشی مارکس هەڵبسوون !..

دەتانەوێ

منارە و گەردنی بەرزی

مەلا عەمامە پاکەکان درووێنە کەن !..

لە کوێ خواوویستێ ووتی ( لا )

وەك تەتەر روو لەو شوێنە کەن !..

بەڵام موسوڵمانی ئەمڕۆ

---

[1] لات : بتێکی گەورەی قورەیش بوو .

دڵنیان لە دوو خاڵی خۆ

خوێنی ئاڵی پێغەمبەران

سووتی ڕێیە

کاردانەوەی خوێنی هەر ( مەلا عومەر ) ێ

وەکو شەهیدێکی میحراب

تا فەتحی مەککەیەکی تر

وەك تۆڵە چاویان هەر لێیـە



# کرنووشی ناسایی خواوویست

زیندانی توربەت  پاکستان ١٧ ١١ ١٩٨٤

---

نامەیەکی سوزو هەستی بەرپرسانەی کراوەیەو بۆ ئەو لاوە خواوویستانەی کوردستان ووتراوە کە هێشتا لە ئیسلامەتی‌یەکەیاندا سەرەتا بوون‌و من بە ناچاری بە جێم هێشتن !

---

.... ( ١ ) ....

هۆ گوڵە گەنمە کاڵەکان
قەت مەپرسن
بۆ تاغووتە خوێن تاڵەکان
لە بوون و چەمانەوەتان
وا ئەترسن ؟!
چونکە ئێوە
کە پشکوتن
نیشانەی دادی خواوویستی و
هیوای کۆنی رەش و رووتن ..
کە دێشنە بەر
لە دایك بوونی عومەر و
رمانی عەرشی تاغوتن ..
چونکە ئێوەی تێگەیشتوو

نیوەی گوڵی پێکەیشتوو
لەو کاتانەی
دوژمن بە زۆر
گەردنتان پێ ئەچەمێنێ
وەکو خۆرن
کە ئاسایی چەمایەوە
هەرچی بوونی غەیری خۆیە
لە ساتێکا ئەسوتێنێ !..

.... ( ٢ ) ....

هۆ گوڵە گەنمە کاڵەکان
دەزانن بۆ
وا تاغوتە خوێن تاڵەکان
دەترسن لە مانەوەتان
لە زیندانیش
سڵن لە چەمانەوەتان ؟!
چون ئەوان خەڵك رادێنن
لەبەردەمی ستەمکاران
سەریان شۆڕ کەن ..
کڕنووش بەرن
تف لە خۆر کەن ..
( نەبوو ) ی خۆیان بسەلمێنن !!
بەڵام خواوویست

کە پەروەردەی ئیسلامی‌یە
لەدایک بوون
لە ناو نەچوون
هاتنە مەیدانی ...
حەتمی‌یـە
لەبەردەمی هەر دوژمنێ
گەر بچەمێ
وەکو ( سەیید )
لوغمی ریشەکێشی ئەو و
تۆوی لەدایک بوونی نوێی
خواوویستی تر
ژێر خاک ئەنێ ! .

.... ( ٣ ) ....

هۆ گوڵە گەنمە کاڵەکان
گەرچی ئێوە
ئاشتی‌خواز و دەروون پاکن ..
گەرچی هێشتا
چەند کەسێکی تەرە و تاکن ..
بەڵام لە فەرهەنگی کوفرا
هەر هەمووتان
خەڵەفاو و
کۆنەپەرستی زگماکن !..

( مـطرف )ی قژ بژ و
دژ مرۆڤ و ترسناکن !..
دەزانن بۆ ؟
چونکە ئێوە
لە کوێرە کانی مێژوا[٢]
بە دادی دین و ژیرەوە
تەقیونەوە ..
لە ریش سپیێتی زەمانەدا
بە غیرەتی ( موغیرە ) ەوە[٢]
هاتوونەوە ..

....( ٤ ) ....

هۆ گوڵە گەنمە کاڵەکان
گەرچی خوا زۆر دلۆڤانە
زۆر بەخشندەو
بە بەزەیی و میهرەبانە
گەرچە هێندە دادپەروەرە
مافی بزنێکی بێ قۆچ
لە هەزار قۆچدار دەسێنێ ..

---

[٢] ئەو کانیانەن کە لە بەهاراندا دەتەقنەوە

[٢] موغیرەی کوڕی شوعبە ـ خوا لێی رازی بێت ـ یەکێك بوو لە یاوەرانی پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ کە بە شمشێرەکەیەوە چووە لای کیسرای فارس و ووتی ئێمە بۆیە هاتووین تا خەڵکی لە بەندەپەرستی رزگار کەین و بیخەینە سەر رێی یەکخواپەرستی .

بەڵام .. بەخیل و زەلیل و
ترسنۆکان دەبوغزێنێ ..
بۆیە لە ڕۆژی دواییشا
موستەزعەف و موستەکبیران
لە یەك جێگەی جەهەننەما
دەسوتێنێ !..

.... ( ٥ )

هۆ گوڵە گەنمە کاڵەکان
نابێ ئێوە چاوەڕێ بن
هەر بەوەی بوونە سەد کەسێ
بۆ ئەم و ئەو
بێ ئەوەی هەڵێ بڕەخسێ
کەواسووری پێش لەشکری
تولە ڕێ بن !!
چونکە ئێوە
ئێستا جۆگای جودا و دوورن
دوژمنانیش
لەسەر قەلاچۆتان سوورن
بۆیە دەبێ
سڵ و سرکانە خۆ زۆر کەن
خۆتان جۆر کەن
دڵنیاش بن
کە هەتا دنیا دنیایە
سیستمی دادی ئەم دینە
لە شیرك و کوفرەوە نایە

هۆ گوڵە گەنمە کاڵەکان
نووسیبووتان
کە زۆر دەمێکە چاوەڕێن
بنووسم سرود و شیعری
باروت و خوێن !..
تا ناسنامەتان دەرکەوێ
کە سەر بە کێن و روو لە کوێن ؟
بەڵام هۆ ئازیزانی من
بەڕێز و دڵسۆزانی من
شیعرەکانی ( کەعب ) و ( حەسسان )
کاتێ قورەیشیان دەترسان
کە لە دووی شمشێری بەدر و
سوپای یەمامە دەوەسان !..
دەبا لەگەڵ شیعر و سروود
وێرد و دروود
ئەمجارەیان
لە شار و دێ
لە نێو کۆڵان و شەقام و لاچەپە رێ
لە هەر لادێ
مەترسی دوژمنی لێ دێ
لەو جێیانەی
پڕ کەند و کۆسپ و بەندەنن
لەو رێیانەی

کەمینی دوژمن دەیتەنن
لەو رووبەروو بوونەوانەی
خواوویستی کورد
وەك ئەسحابە
بە رووی مەرگا پێ ئەکەنن
لەو شوێنانەی
زات و وورەی پواو دەشکێن
کاتێ وەکو ئەفغانستان
شەپۆل پێك دا ئەدا خوێن
ئا لەو کاتە
کە هێز و دادی خواوویستی
پێکەوە دێن
دڵنیا بن .. بەس لەو کاتە
لە هەموو لایەك دەناسرێن
کە ئێوەی خاوەن ئەو هێزە
چین و کێن و لە کوێوە دێن !..
بەڵام بێ بوونی ئەو هێزە
نەوەك شیعر
نەوەك شاعیر
کام داعیەی زۆر بەرێزە
دەبینی سەری زۆر بەرزە
وەکو سەری ئیمام حوسەین
بەڵام لەسەر نووکی نێزە !!

# هیوای پیاوی بێ چەك

جاجی ئەففانستان ۷ ۱۹۸۸

مێزی کوفر
با سەر ببڕن
با سك بدڕن
با بکوژن
با خوێن بڕژن
ئابڕوو بتکێ
با قورئان بخەنە ژێر پێ
با هەموو مزگەوت بڕوخێن
با میحراب پڕ ببێ لە خوێن
با خواوریستی خاوەن ئەسەر
لە زیندانا
نە مزگەوت و سەرشەقام و
لە ناو کوچەو کۆلانانا
بڕوا .. وون بێ ، بێ سەر و شوێن !!
چی بکەین ئێمە
کە ئەمە قەدەری خوایە ..
( الخیرُ فیما وقعَ ) و

ئێمەش هیچمان لەدەست نایە ..

ئێمەی بیر تیژ

دەبێ سوور بین لەسەر رامان

لەسەر رێ بین

هەتا لە پەرلەمانێکا

خاوەن جێ بین

لەوێ رەنجمان دەخەینە کار[1]

تا دژی ئەم تاوانانە

هەموو را دەین

بە ( رەفزو شەجب و تەندید )ی ناو پەرلەمان [2]

دەسەڵاتی کوفر رادەین ..



[1] وەك ئەو برا بەستەزمانانەی هیوایان بە پەرلەمانی میسر و ئوردن و متد هەیە

[2] وشە فشەڵە ناڕەزاییەکانی سیاسەتی ئەمڕۆ !

# هۆ هەڵەبجە

پاکستان ٢٠/٤/١٩٨٨

هەڵەبجە لە روانگەی ئیسلامی‌یەکانی کوردستانەوە شارێکی سەرکردایەتی و بنکەیەکی ئیسلامی بەهێز بوو ، چونکە لە رووی رێکخستن ( تەنزیم ) و تەوجیهی‌یەوە زۆربەی جێگاکانی کوردستانی ئاراستە دەکرد . بۆیە هیواو ئاواتی گەورەی هەموو لایەکمان بوو بۆ بەرپا کردن و راگەیاندنی جیهاد . بەڵام زۆر بەداخەوە تەنانەت لە دوای ئەو کارەساتە دڵتەزێنەش کە بەسەریدا هات کاتی جیهادی ـ لە لای ئارامگرەکانی مەککە ـ هەر نەهات و هەر نەهات !!

ئەم شیعرەش گلەیی‌یەکی برایانەیە و لەو برایانە دەکرێ ، نەک هەر شیوەن و لاوانەوەیەکی شاعیرانە ..

.... ( ١ ) ....

هۆ هەڵەبجەی کوفر بەزێن
شاری دلێر
شاری هیوای خەڵتانی خوێن
زۆر دەمێ بوو
هێزی کوفر دەیانزانی
مناڵانی کانی قوڵکە[1]

[1] کانی قوڵکە : گەڕەکێکە لە هەڵەبجە .

بزماری مینبەرێکی نوێن ..[٢]
زۆر دەمێ بوو دەیانزانی
راپەڕێنت
شمشێرێکی بێ کالانە
بە دەست شێرزادەی بەوەفای
جیهادی صەلاحەدینت

.... ( ٢ ) ....

هۆ هەڵەبجەی کوفر تەزێن
شاری نەبەز
ئاواتی سێ ملیۆن کوردی
موستەزعەفی بێ سەروشوێن ..
زۆر دەمێ بوو
هێزی کوفر دەیانزانی
نەڕەی تەکبیری جەژنەکان
هەورە گرمەن ..
سەدای جیهادی ئەفغان و
بروسکەیەکی حوتەینی ئەم سەردەمەن ..

---

[٢] دوای ئەوەی خاچ پەرستەکان ماوەی ٨٨ ساڵ قودسیان داگیر کرد . لە ٢٧ی رەجەبی ٥٨٣ ی کۆچی- ٢ ١٠ ١١٨٧ ز صلاح الدینی ئەییوبی - رحمه الله - دوای شەڕی حطین ئازادی کردەوە خاچ پەرستەکان کە چوونە ناو مزگەوتی ئەقصاوە لە قودس میحرابەکەیان روخاند و پیسایشیان کرد بەسەر میحرابەکەیدا .
ئەوکاتە صلاح الدینی رەحمەتی لە حەلەب بوو. فەرمانی کرد بە دارتاش و مینبەرێکیان وەك ئەوەی ئەقصا دروست کردەوە ئەویش جێگا بە جێگای شەڕ لەگەڵ خۆی دەیبردە پێشەوە تا دوای بیست ساڵ لە جێگای مینبەرەکەی پێشوو دایاننایەوە !!.

....(٣)....

هۆ هەڵەبجەی بێ سەرو شوان
شاری شین و ئازار و ژان
شاری هەتیو
شاری هێزی خۆ نەناسیو[٢]
هێزی کوفر دەیانزانی
تۆ رابەری
تۆ منارەکەی ئەزهەری ..
زۆر دەمێ بوو
دەیانزانی ئەمرۆکە تۆی
قەڵای سەختی خواویستی کورد ..

....(٤)....

هۆ هەڵەبجە
شاری فەقێی عەودالی من
هۆ ژان و ناسۆری کورد و
هیوای زیندە بەچاڵی من
گەر دەمزانی پۆشاکی‌رەش
بۆ عەزاداری ( جائز ) ە
لە موسابەقەی قورئانا

---

[٢] هێزە ئیسلامی‌یەکەی هەڵەبجە و ( کوردستانیش ) چونکە چارەڕێی برا گەورە عەرەبەکانی دەکرد هەر بە هەتیووی مایەوە ''

له هەموو مزگەوتەکانا
بۆ منالْ و گەنج و پیری کوردەواری
کوتالی رەشم دەهێنا
لەگەلْ سورەتی تەوبە دا
بۆم دەکردن بە ( جائزە ! .. )

.... ( ٥ ) ....

هۆ هەلەبجە
هۆ سەروەت و سامانی من
گڕی بەر بوو لە گیانی من
گەر دەمزانی
پۆشاکی رەش
لە تەعلیماتی دینیتا
لە پرسەو ماتەمینیتا
دەشێ ئێمە بیکەینە بەر
تەنها هەر ئەوم نەپۆشی !..
گەر دەمزانی
غەیری چەك سوودێکی دەبێ
دوانزە سەعاتی هەر رۆژم
دادەنا بۆ سینەکوتان و سەرەخۆشی !..
ئێستاش دەگریم
بەلێ دەگریم
وەکو کوردیش

هەر دەگێرم گەرمە شینێ
بۆ پەیکەری هیوای مردوو !!
بۆ ئەو کۆرپەی
بە دانانی کۆڵی قورسی جیهادەکەت
لە بارت چوو !!... [٤]

.... ( ٦ ) ....

هۆ هەڵەبجە
هۆ هێمای ئازایەتی مە
شاری رابەرایەتی مە
بیرتە لە نێو ژان و خەما
سۆز و غیرەتت دەجوڵا
بۆ ژانی زەینەب غەزالی [٥]
بۆ ترۆری خوشکە بەنان[٦]
بۆ خوشکی زیندانی حەما
بۆ خوشکی دووری هاودینان

---

[٤] ئافرەت بە هەڵگرتنی کۆڵی قورس منداڵی لەبار دەچێت ; بەڵام ئەم بە دانانی کۆڵی قورسی جیهاد.

[٥] زەینەب غەزالی : ئافرەتێکی موسوڵمانی خۆگری نێو زیندانەکانی جمال عبد الناصر بوو لە میسر . لە سەرکردایەتی إخوان المسلمین بوو

[٦] بنان : کچی علی الطنطاوی و خێزانی عصام العطار بوو لە ئەڵمانیا لە شاری ئاخن لە ساڵی ١٩٨١دا لە لایەن بەکرێگیراوانی بەعسی سووریەوە ترۆر کرا.

**کەچی لە بەدبەختی خۆمان**
**بۆ هەزار خوشکی ( سەبایا ) ی**
**ئەنفالی کورد**
**لە قەرەداخ ، لە سەرگەڵو ، لە بادینان**
**لەو غیرەتە**
**هیچت نەما !!..[۷]**

**.... ( ۷ ) ....**

**هۆ هەڵەبجە**
**هۆ دێرینە ئاواتی قووچ**
**خاکی بە پیتی تۆوی پووچ**
**بۆ رازی بووی**
**لە حەفتاکان**
**داسێکی کوڵ قەدت بڕێ ..[۸]**

---

[۷] شاری حەمای سوریا ، لە سالی ١٩٨٢ دا رژێمی سوریا وێرانی کرد ، ئەو خوشکانەش لە ناو زیندانەکانی ئەو رژێمەوە ئەو نامەیان نووسی و لە دەرەوە بلاوکرایەوە نامەکەی ئەمان و کتێبەکەی زینب الغزالی کە ناوی ( ایام من حیاتی ) ە کرانە کوردی و بە نامە و شریت لە کوردستاندا بلاو کرانەوە .. دەیان خوشك و برای ئیخوانی خۆشمان کچەکانیان ناو دەنا ( بەنان ) . بەلام بەداخەوە کەس بۆئەو هەموو خوشکە داوێن پاکانەی کورد کە کەوتنە بەر شالاوی هێرشە ستەمکارەکانی صدامی درندە وتەی لێوە نەهات کە لە سالی ١٩٨٨ دا کردنی ، کە سێ هێرشی گەورە بوون هەموو کوردستانی گرتەوە .. ئەو ئافرەتە کوردانەی بە دیلی و زەلیلی برانە سەر سنووری سعودیە و لەوێ دەفرۆشێنران '' ژمارەیان ٣٨ هەزار ئافرەت بوون ' صدام ئەو سێ هێرشەی ناونا ( ئنفال ) تا حەلالێتی شەڕەکە و دەسکەوتەکانی لە مێشکی عالەمیندا بچەسپێنێ '' وا دیارە توانیشی !!

دیسان هێشتت
لە هەشتاکان
بەرهەمی نەوەی خواوویستی
قاچاخچی‌یەك
لە بەسرەوە
نەك بە نرخی کوڕی یەعقوب[٩]
بە هەرزانتریش بیکڕێ !!..

.... ( ٨ ) ....

هۆ هەڵەبجە
شاری هیواو ئاواتی مە
ڕەنجی خەسار
ئاڵۆزی کارەساتی مە
شاری تاساو
داهۆڵی تەنزیمی خەساو[١٠]
ئێمەی کڵۆڵ

---

[٨] خاکی دڵی کورد بە پیتە بۆ ئیسلام . بەڵام بە داخەوە تۆوی (اخوانەکە) پوچەڵ بوو ' بۆیە حزبێکی ئیسلامی لێ شین نەبوو  چونکە ( اخوان المسلمین ) ی عێراق لە ساڵی ١٩٧١ دا لەسەر داوای حزبی بەعسی حاکم تەنزیمی حزبیان لە سەرانسەری عێراقدا هەڵوەشاندەوە .. ئەو تەنزیمەی لە ساڵانی هەشتاکاندا بە هەزار دەردە سەری دروستمان کردەوە برا ئیخوانە عەرەبەکان گرتیانە خۆو خەساندیان !..

[٩] کوڕی یەعقوب : مەبەست لە (سیدنا یوسف)ە ( سەلامی خوای لێ بێت ) کە بە منداڵی لە میسر بە نرخێکی کەم فرۆشتیان

[١٠] داهۆڵ : ئەو پەیکەرە دارو پەڕۆیەیە کە لە باخ و بێستاندا دادەنرێت . تا باڵندە وا حاڵی بکرێت کە گوایە مرۆڤە . و لە ڕاستیشدا هیچ نی‌یە

چاوەڕێ بووین تۆی ( گورج و گۆڵ ! )
لێرە و لەوێ
وەك پێشڕەوێ
زوو بێیتە دەست !
هەر هەموومان بگریتە خۆ
وورە و وورزەو باوەڕ و هەست !
بەسەر کاسەی سەر و خوێنا
پێشمان کەوی
بەرەو هیوا
بەرەو هێنانە دی مەبەست !!
بەڵام هەی داخی گرانم
لە جێی ئەوە
دەست و قاچی ئێمەشت بەست !!..[11]

.... ( ٩ ) ....

هۆ هەڵەبجە
هێمای هەڵمەت و خرۆشان
بۆچی دەتهێشت کورد فرۆشان
ئەوانەی وا
بە ناو خەبات و تێکۆشان
تۆوی کوفریان رادەهێشت

---

[11] چونکە هەر کاتێك ئێمە بکەوتینایەتە جم و جوڵێکی ئیسلامی دەیان ووت : پەلە مەکەن برایانی هەڵەبجە ( شتێك ) یان بەدەستەوەیە بیکەن !..

لەگەڵ ( بە ناو دۆست ) ی کەرا
بێن و تۆ بکەن بە نیشان
بۆ رق و قینی کیمیاوی
دوژمنی سەرسەختی پێشان

.... ( ١٠ ) ....

هۆ هەڵەبجە
بۆ رازی بووی
بیرەوهۆشی دۆستێکی دوور[١٢]
بە بۆچوونی لێڵ و ماندووی
نینۆکت کا ..؟!
بۆ رازی بووی
بە رای نامۆی ئەو دیوو سنوور
ترساوو کرینۆکت کا ..؟!
گوایە هێشتا هەر چاوەڕێی
لە تۆڵەی شاری روخاوا
لە تۆڵەی خوێنی رژاوا
زرێکەی (بەننا) لەبەر کا ..؟![١٣]
دەتا دەمری
چاوەڕوانی بێ هیوا بە

---

[١٢] مەبەست لە برا ئیخوانییە عەرەبە عێراقییەکانە کە لە دەوڵەتانی خلیجەوە تەعلیماتیان دەنارد .
[١٣] مەبەست لە خۆ ئامادەکردنەکەی ئیمام (حسن البنا)یە کە بردنییە شەڕی ئینگلیز لە میسر وجولەکە لە فەلەستین لە ساڵی ١٩٤٨

دوای چەندەها کۆنگرەی خۆی
بەیانێکت لەسەر دەرکا !!..
من دەزانم
نا ئومێدیشی و چاوەڕێی
بۆ خوێنی تۆ
بۆ مافی تۆ
بگۆڕێ راو بۆچوون و رێی ...؟!
نا زۆر هەڵەی
من دڵنیام دوای چەند ساڵێ
تۆش وەکو من
تێ دەگەی لێی ..
بەڵام شەرت بێ
ئەو هەڵوێستە نامۆیانەی
بە خوێنی خۆم و هاوبیرم
بگۆڕم پێی ...



# تریاکی مارکسیزم

١٩٩١/١٢/١٨...

له گۆڕستانی مێژوا
( گۆرباتشۆف ) م دی خەریکە
له ریزی گۆڕی ( یزم ) ەکان[١]
بۆ (مارکس) و (مانیفێست)ی[٢]
خەریکە گۆڕ هەڵکەندنە !..
لەملاشەوە
هەرزە بیری ژێر دەستەکان
کورد و تامیل ، بەلوچ ، پەتان[٣]
که ژینیان نیوە مردنە
بۆ ئاڵای سووری چەکوش و داس
هەتا ئێستاش
پێشمەرگەن و
پەتی دەوڵەتی رماویان لە گەردنە !
لە لای گەلانی بێ وڵات

---

[١] وەك ( سۆسیالیزم ، داروینیزم ، سکولەریزم ..هتد )

[٢] ئەو بەیانە هاوبەشەی مارکس و ئەنجلسە کە لە ساڵی ١٨٤٨ ز دا بڵاویان کردەوە و بۆتە چوارچێوەی تێڕوانینی مارکسیێتی

[٣] تامیل : گەلێکی سریلانکی ژێر دەستەی نەتەوەی سەنهاڵ حاکمن
بەلوچ : گەلێکی چەوساوەی دابەشکراوە بەسەر ئێران و پاکستان و ئەفغانستاندا
هەروەها پەتان : ئەوانیش دابەشکراوی سەر سنووری ئەفغانستان و پاکستانن .

تازە جەژنی
لەدایك بوونی مارکس و
دژی مۆتەکەی بورژوا
کاتی شەوارە گرتنە !..
لەملاوەش .. کلکە مەلایەك
کەنوێنەری ( اتحاد العلما )ی نارەسەنە
ئەویش بۆ شاباشەکەی خۆی
خەریکی قورئان خوێندنە !!
خەتیبێکیش
( بانگی حەق ) بە گوێی دا دەدا و
دەڵێ ئای کۆرپەی بەختەوەر
خۆزگەم بە خۆت
بۆ جیهان دەبیە پێشەواو
بۆ کرێکارانیش رێبەر ..
دە بە کوێری چاوی دوژمن
هەر گەشکە بگرە و پێ بکەنە ..
سید قطبیش بەسەر سێدارەوە دەڵێ
بڕوانە بیری جاهیلی
نێو خەڵکی ئەم دوو دیمەنە
دوای رمانی
( بەهەشت ) ە پڕ ئاسۆزەکەی مارکسیزم
تازە لای مە
باسی ( وڵاتی بێ پارە )
بەڵگە نەویستە .. حەتمەنە !..
جا بڕوانە تریاکی مارکسیزم و
ئا ئەم ژێری خەساندنە !!..

# بۆ هێزێکی لە دایك بوو

هەولێر : زۆزك ۸.۱۹۹۱

بۆ ئەو ئاواتەی نەمردم و دیم . بوونی پێشمەرگەی ئیسلامی لە سەربازگەی صلاح الدینی خۆمان کە لە ۲۰.۵.۱۹۹۱ دا کردمانەوە ..

زۆر دەمێ بوو
چاوەڕێ بووم
لە ئاسۆز و خەم و ژانا
لە غیرەت و ورەو ووزە و
خۆشەویستی تێکۆشانا
بە ڕێی خەباتی کوردانەی
شا مەحموود و
شێخی مەزنی پیرانا[1]
بە تەجروبەی
میللەتی کوردی بێ شوانا
بە کڵپەی گڕی باوەڕی موسوڵمانا
چاوەڕێ بووم
لەبەر تیشکی

---

[1] شێخ سەعیدی پیران و شێخ محمودی حەفیدی رەحمەتیان .

مەشخەڵی ڕێی
بیری سەییدی زیندانا
هێزێکی وا لەدایك بێ
بڵێین ئۆخەی
ئا ئەمە هێزی ئیسلامە
لە ڕووی دۆستانی دڵسۆزا
وا بە شەرمە و
لە ڕووی دوژمنا بە سامە



هۆ هێزی گەنجی جیهادی
زایەڵەی کاروانی شادی
هێزی هیوا
گزنگی ڕۆژی ئازادی
تۆ شمشێرەکەی موغیرەی[٢]
دەنگی سوڵتانول عولەما و[٣]
قوتابی‌یەکی زیتەڵی
فیقهەکەی ئیبن و تەیمیەی

---

[٢] موغیرەی کوڕی شوعبە : یاوەر ( صەحابە ) یەکی پێغەمبەر بوو ، صلى الله عليه وسلم ؛ یەکێکە لەو چوار کەسەیە کە پێیان دەڵێن بلیمەتانی عەرەب ( دهاة العرب )
[٣] عیززی کوڕی عبد السلام : کە چاونەترسترین زانای شافعی بوو . بە ڕووی حاکمی میسردا ڕاوەستا

چ مژدە بووی

لە عومری کەمی ئێمەدا لە دایک بووی

هەزار شوکر

هەزار ئۆخەی

کە ئێمە بووینە هێزی تۆ و

تۆش زادی هەوڵ و رەنجی مەی



دە بەیعەت بێ تاکو تۆ هەی

دروشمی مە

دەنگی دلێری صدیقە

کە لە رۆژی سەختی ( ردە )[1]

هەموو جیهان بیستی گرمەی :

( أیُنقص الدینُ هذا وأنا حي ؟ )



---

[1] رۆژی پاشگەز بوونەوەی زۆربەی عەرەبەکان بوو لە ئیسلام ، دوای وەفاتی پێغەمبەری نازدار (صلى‌الله علیه وسلم )

# فەرهەنگۆك

## - أ -

ئاتاج    پێویستی ، پێداویستی : احتیاج
ئاژانس    هەواڵدەرانی ڕۆژنامە و رادیۆو..هتد : خەبەر گوزار
ئەسوی    یەکی نەکەوی و لە کار نەکەوی
ئاگرپژێن    بورکان : ئاتەش فشان
ئالێرا    بادرا ئۆی : تیودی پیچرا
ئامێر    ئالەت : دەزگا
ئیشك    پاسەوانیتی : حراسەت

## - ب -

بزر    وون بوو ، گوم بوو
بشگلێم    بشکەوم
بوون    هاتنە جیهان : وجود
بێروون    ناوچەی ووشکانی و بێ ئاو
بەیت و بالۆرە    ئەو گۆرانیانەی لۆتی و شایەر لە شاییدا ئەیانڵێ

## - پ -

پواو    رزیو : گەندەڵ
پێر    دەستە : کۆمەڵ : تاقم
پەڕەوازە    پەرتەوازە : لێك دابراو
پەجەرزکە    پەجەرەی بچکۆلە

## - ت -

تاسار    سر : مت بوو : بێ جم وجوڵ
تاف    تافی لاوی : هەرەتی لاوی
تەعریب    سیاسەتی بە عەرەب کردن
تێشوو    زاخیرە : تفاقی سەفەر

## - ج -

| | |
|---|---|
| جودا | جیاواز ، جوێ |
| جوورراو | ئەو خواردنەی لە دەمدا دانی پیدا نراوە |
| جینگلە ئەدەن | ئەتلینەوە : ئەمدیووئەو دیو دەکەن پیی |
| جیگیر | دابین بوو : دامەزراو : چەسپاو |

## - ح -

| | |
|---|---|
| حەشار داوە | شاردویتی‌یەوە : پەنهانی کردووە |

## - خ -

| | |
|---|---|
| خاچ پەرست | صەلیبی |
| خامە | پێ نووس ، قەلەم ، خودکار |
| خورە | ئەو کرمەی نێو درەخت دەخوات رگەندەلی دەکات |

## - د -

| | |
|---|---|
| دابراین | لیك جیا بوینەوە ، هەر یەك کەوتینە لایەك |
| داخورپی | داچلەکین : راچەنی : بلەرزی لە ترسا |
| دەسەوسان | ناتوانا |
| دیاردە | روالەت |

## - ر -

| | |
|---|---|
| رابهێلن | رابکێشن : بۆ شۆڕ بکەنەوە |
| رادەبوورێ | دەروات : تێ دەپەرێت |
| راسپاردە | ئەو قسەیەی دەوترێ بۆ ئەنجامدان |
| راوێژ | پرس کردن : راوەرگرتن : مشاوەرە |
| رۆخ | کەنار : قەراغ : لێوار |
| رەش و رووت | چەوساوە : موستەزعەف |

## - ز -

| | |
|---|---|
| زامار | زامدار : بریندار : زەخمدار |
| زوخالْ | سوتاویك بووبیته خەلوز : رەژوو |
| زەنگول زەنگول | دلوپ دلوپ : قەترە قەترە |
| زەنگی پشوو | زەنگی تەفریح : نیوانی دوو دەرس |

## - ژ -

| | |
|---|---|
| ژوار | ژان . ئازار : ئیش : ئەلەم |
| ژیلەمو | ئەو خولە میشەی پشکوی تیا ماوە |

## - س -

| | |
|---|---|
| ساریژ | قەتماغە بەستن : چاك بوونەوەی برین |
| سپات | رەنگی خولە میشی : رەصاصی |
| سپێدە | روناكی بەری بەیانی : شەفەق |
| سنوور | مەرز : حدود |
| سیخور | مەزدور : جاسوس |
| سەپان | دروینە گەر |
| سەرزارەکی | بە ئاشکرا : عەلەنی |

## - ش -

| | |
|---|---|
| شارا | کومەلە گەنم یا جوی درراوو سەریەکتر نراو |
| شارستانی | پیشکەوتوویی : ئاوەدانی و رانستی : تمدن |
| شیخەل | دەوەنی گەورە |
| شیواز | جور : چەشن : ئوسلوب |

## - ع -

| | |
|---|---|
| عەودالْ | ئامەزرۆ : شەیدا : ویلی دووری مەبەست |

## - ق -

| | |
|---|---|
| قر | قران : نەمان : فەوتان |
| قوناغ | ماوە : مەرحەلە |

## - ك -

| | |
|---|---|
| کاویژ | ئاژەل خواردنەکەی کە دەیخوات جاریکی تر دەیهێنێتەوە دەمی وبو جوینەوەی |
| کپ | مت : کر : بێ دەنگی |
| کودی | کولەکە : کەدو |
| کرێ گرتە | بەکرێ گیراو : مەزدور : عەمیل |
| کلێتە | کلاویکی گولێنکە داری کورد چنە . لەسەرەتای شۆرشی کوردستانی عیراقدا هێمای پێشمەرگە بوو |
| کزیلە | بەندە : بەردە : عەبد |
| کەرسەك | توپەڵە گلی یەکگرتوو |

## - گ -

| | |
|---|---|
| گرگن | کورتە بالا : قزم |
| گزنگ | سەرەتای دەرکەوتنی تیشکی خور |
| گوڕەپان | ساحە : مەیدان |
| گوشەگیر | دوورە پەرێز . کەنار گیر . منعزل |
| گەشە | نەشونما : پێگەیشتن : نمو |
| گەمارۆ | ئابلوقە : چواردەور گرتن : محاصرە |

## - م -

| | |
|---|---|
| مەرەز | تیسکی نەرمی بزن کە رەنگی خورمایییە |
| مەلۆ | کومەلێك گەنم یا جۆی دوراو |

## - ن -

| | |
|---|---|
| ناژاکی | ناشیری : تیك ناچیت |
| نزا | پارانەوە : دوعا |
| نوزە | دەنگی نزم کە بە دەم ژانەوە دەردەبری |
| نێچیر | راوکراو : الفریسە |

- ھ -

| | |
|---|---|
| هوكانی راگەیاندن | وەسائیلی تەبلیغ : وسائل الإعلام |
| هێما | نیشانە : رەمز |
| هەر بوو | ئەزەلی و ئەبەدی . سەرمەدی : هەر بووە هەر ئەبێ |
| هەرزە | جەحێل : گەنج : جوان : مراهق |
| هەڤاڵ | پلەیەكی حزبی‌یە بە مانای هاوڕێ |
| هەلزناوە | خۆی پێدا هەلروسكاندووە خۆی پێدا هەلواسیوە |
| هەون | ئەون |
| هەوێن | ئامیان ، مایە ، خومرە |

- و -

| | |
|---|---|
| وان | ئەوان |
| وەردیان | جەللاد ، دژخیم |
| وێرد | ووتوێژی تەسبیحات |

  

## - پێرست -

هۆ هێزی گەنجی جیهادی

زایەڵەی کاروانی شادی

هێزی هیوا

گزنگی ڕۆژی ئازادی

تۆ شمشێرەکەی موغیرەی

دەنگی سولتانول عولەما و

تۆ [illegible]

[illegible] و تەیمیەی

[illegible] بووی

لە [illegible] ئێمەدا لە دایک بووی

هەزار شوکر

هەزار ئۆخەی

کە ئێمە بووینە هێزی تۆ و

تۆش زادی هەوڵ و ڕەنجی مەی .